کانی کتێب

# فەرهەنگی



# ڕووەکناسی کوردستان



## کوردی، فارسی، ئینگلیزی، عەرەبی، لاتین

---

گژوگیا، دار و دەوەن، دارچک و چڵاک، دڕک و داڵ، چقڵ و گوڵ
گیادەوایی و گیابژار، گیابڕ و گیابۆژان، گوڵی ئینجانە و جوانکاری

**لەگەڵ شوێنگەی ڕسکان و شینبوون لە ناوچەکانی کوردەواری**
**ئێران، عێراق، تورکیە و سووریە**



کۆکردنەوە و توێژینەوە

ئەندازیار ئیرەج مورادی (باقلاوایی)

وه ناو خودا كه دەهندەس و دلۆڤان

# فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان

# فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان

(کوردی- فارسی- ئینگلیزی- عەرەبی- لاتین یا زانستی)

گژوگیا، دار و دەوەن، دارچک و چلاک، دڕکوداڵ، چقڵ و گوڵ، گیادەوایی و گیابژار، گیابڕ و گیابۆژان، گوڵی ئینجانە و جوانکاری

لەگەڵ شوێنگەی ڕسکان و شینبوون لە ناوچەکانی کوردەواری
ئێران، عێراق، تورکیە و سووریە

**کۆکردنەوە و توێژینەوە**

**ئەندازیار ئیرەج مورادی (باقلاوایی)**

| | |
|---|---|
| سرشناسه: | مرادی ایرج، ۱۳۶۳ |
| عنوان و نام پدیدآور: | فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستان (کوردی ـ فارسی ـ ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ زانستی یا لاتینی) / کوکردنەوە و تویژینەوە: ئیرەج مورادی (باقلاوایی) |
| مشخصات نشر: | تهران: کانی کتیب، ۱۳۹۴. |
| مشخصات ظاهری: | [پەنجاوپەنج]، ۷۴۸ ص. |
| شابک: | ۹۷۸-۶۰۰-۷۹۶۸-۰۹-۳ |
| وضعیت فهرست نویسی: | فیپا |
| یادداشت: | چندزبانه |
| موضوع: | گیاهان دارویی ـ واژەنامەهای چندزبانه |
| موضوع: | کردی ـ واژەنامەها ـ چندزبانه |
| ردەبندی کنگره: | ۱۳۹۴ ۴ف ۴ م /RS۵۱ |
| ردەبندی دیویی | ۶۱۵/ ۳۲۰۳ |
| شماره کتابشناسی ملی: | ۳۴۲۲۹۱۹ |

# فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستان

## ئیرەج مورادی (باقلاوایی)

ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: مەحیەدین کەریمیان
ڕووبەرگ: مەسعوود نیکخاه
چاپ: ١٣٩٤، یەکەم
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
شابک: ٣-٠٩-٧٩٦٨-٦٠٠-٩٧٨
سەرپەرشتی چاپ: شوان تاهیری
نرخ: ٣٠٠٠٠ تمەن ـ ١٢٠٠٠ دینار
ناوەندی بڵاو کردنەوە:
سنە، **کانی کتێب** ـ ٠٨٧ـ٣٣١٢٥٢٥٩

دیاری بە:

- سروشتی جوانی کوردستان و گشت وەرزێر، ڕەزوان، باخەوان، دەشتەوان، شوان، ژینگەوان، سەپان، تەڕەوان، تووچین، شاخەوان، دارەوان، جووتیار، نمامکار، ئاودێر، گیاپەروەر، گیاپزیشک، گیافرۆش، گیاخۆر، گیاناس، گیادۆست، هەتوانساز، حەکیمی خۆمالی، پزیشک و گیادەرمانی کوردەواری

- دایک و باوکی خۆشەویستم کە لە پێناو پەروەردە و خوێندنمدا گەلێک ماندوو بوونە
- خێزانی هاوسەر، هاوژین، هاوبیر و هاوڕێم کە هەمیشە هاندەر و هاریکارم بووە
- کیژۆڵەی دڵگەشم «ژیانا» گیان

- هۆنەری پایەبەرز مامۆستا شەریف حوسێن‌پەناهی کە یەکەمجار لە فێرگەکەیدا فێری خوێندن و نووسینی کوردی بووم
- نووسەر و وێژەوانی هێژا کاک ماجدی مەردۆخ ڕۆحانی کە ڕێچکەی فەرهەنگ‌نووسی پێ ناساندم و ئاشنای کەند و لەندەکانی ئەم بەستێنەی کردم
- حەکیم کاک بورهان حوسەینی گیادەرمان و مامۆستای پزیشکی خۆماڵیی کوردەواری لە ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان کە چرای پێوەندی گیاناسی و گیادەرمانی پێ نیشان دام و ئاشنای بنەماکانی سامانی بەنرخی پزیشکی خۆماڵیی کوردەواری (KTM) کردم
- هەڤاڵی هێژا کاک مەحیەدینی کەریمیان کە هەر لە سەرەتای فەرهەنگی فارسی - کوردی زانکۆی کوردستانەوە بۆ ئامادەکاری و ڕێکخستنی ئەم بەرهەمە ڕووەکناسیە یارمەتی داوم و سەرنجام کاری ڕازاندنەوەکەشی وەئەستۆ گرت
- هەڤاڵی بەڕێز و زانام دوکتور یەدوڵلا پەشابادی مامۆستای زانکۆی باهونەری کرمان کە پێشەکیەکەی خوێندەوە و زۆر خاڵی گرینگی پێ نیشان دامەوە

## پێرستی گشتی

## دەسپێک

| | |
|---|---|
| ئەی خاوەن ڕەحمەت! درگاگەل ڕەحمەت | وا بـــــکەرەوە بـە ڕووی دڵـــــمانا |
| بە دڵ، بە زوان، بە قـــەڵـــەم، بـە مـاڵ | ڕێژنەی ڕەحمـەت بـین بـە سـەر بێسـانا: |
| بێسـانی تینـــووی ژیـانی هـــــەژار | کوڵۆڵـی بـار کـا لـە نـــاو ئینــــسانا |

بـەجێگـەتـرین و جـوانترین جلکـی شـیاو بـۆ سروشـتی سـەرگۆی زەویـن -کـە خواگیـان ئافراندوویە- «ڕوەک»ـە. ڕوەک ڕسکانی ژیانە لە ناخی خاکەوە بۆ ئاقاری سەرزەوی.

بەپێی بۆچوونی ژیرمەندان و پسپۆڕانی زانسـتی، زینـدەوەرانی گێتـی بـریتین لـە دەسـتەی زینـدەوەرانـی بـەرایـی و دوایـی. دەسـتە بـەراییـەکـان ئـەوانـەن کـە زۆرتـر بـەهـۆی ئـامێرە مایکرۆسکۆپیکەکانەوە دەبینرێن وەکوو بەکتریا و کـوارگ. دەسـتەی زینـدەوەرانـی دواییش وەکـی کـرپێژەبـەرد، ڕوەک، مێـروو، مـەل، مـار، ئـاژەڵ و مـرۆڤ، بـەڵـام بـەپێـی بیرۆکـەی فەیلەسووفان "گیان" بە شێوەی زیندەواری و پێشکەوتوو چووەتە تەن و تـاری سێ دەستەی ڕوەک، حەیوان (ئاژەڵ، مێروو، مەل و مۆر) و ئینسان. بەواتایەکی ئاسان گیانێکە ئێمەی مرۆڤ لەم دنیایەدا پێی زیندووین هەمان گیانە لە شانەی ڕوەک و تەنی حەیوانەکان، بەڵـام ئـەم گیانـە لە ڕوەکەوە پلەکانی پێشکەوتن دەپێویت هەتا دەگاتە ئێمەی مرۆڤ.

بەستێنێ کە بە فراوانی و پانتایی سەرگۆی زەوی هەر سێ دەسـتەی ڕوەک و حـەیوان و مرۆڤی لە خۆدا گرتووە، سروشتە. سروشت واتا هەمان ماکە سەرەکیەکـانی ئـاو، هـەوا و خـاک کە پێوەری تاک و تایبەتین بۆ هەمی زیندەوەران. ڕەنگە ئەوەیکـە فەیلـەسـووفەکـان دەسـپێکی ژیان لە ڕوەکەوە باسی لێو دەکەن هەمان بابەت بێ کە ئەگەر ڕوەک بسـڕێتەوە لـە سروشـت، بـە ئێجگاری هەر دوو دەستەی مرۆڤ و ئاژەڵ لەنـاو دەچـن. چونکـوو ڕوەکـە وزەی سـەرچـاوەی سـەرەکی گەردوون لە هـەتـاو وەردەگـرێ و دەیکـا بـە بژیـو و هـەناسـەی ژیـان. ڕوەک بـەهـۆی کارگەی فتۆسەنتزەوە چێشتەمەنی و ئۆکسیژن مسۆگەر دەکات و بە هەمـی زینـدەوەرانـی زەوی دەبەخشێ؛ بۆیە بێ ڕوەک ژیان ناگەشێ.

ڕوەک سامانێکی بەهامەند و دەوڵەمەندە. سفرە و خوانێکی ڕەنگین و سەنگین و زەنگینە. خوانێکە خواگیان پێش خولقانی مرۆڤ ئافراندوویە و ناومالی زەوی چەشنی بژیو، سەیران، گوزەران، هەتوان و ڕاخەری نیشتمان ئامادە کردووە. بێ دەستێوەردانی مرۆڤ، ڕوەک خۆی دەڕوێت و دەگەشێت، بەر دەدات و سێبەر دێنێت، دووکەڵ هەڵدەمژێ و هەناسە دەپشێت، تاو دەگرێت و تین دەبەخشێ، بەرگری دەکا لە داشۆرانی زەوی و ڕادەگرێ پیت و پێزی، باراناو گل دەدات و بەری بۆران دەوەستێ، شوێنی هێلانە و پشووی سەیرانە، بیاوان دەکات بە کوێستان و بەهار دێنێ بری زستان، بەڵام کاتێ دەستێوەردانی مرۆڤ بە هەموو شێوە لە کشتوکاڵ و کۆڵان و کێڵان هەتا دەگاتە سووتان و قڕان و بڕان دەتوانێ زنجیرەی ئاسایی سروشت تێک بدات و جەماوەری ڕوەک بخاتە بازنەی باس و مەترسیەوە. کەوابوو ئێمەی چینی مرۆڤ وەک زیندەواری ژیرمەند و پێشکەوتوو بەرپرسیارین بەرانبەر پاراستن و ناساندنی جەماوەری ڕوەک. پێویستە بە هەستێکی ئەمەگداری و نیازپاکانەوە بەرامبەر هەموو چڵێکی ڕوەک دانوسان بکەین. چونکە کاتێ هەڵسوکەوتی ئێمە لە پێناو ڕوەک و گشت سروشتدا باش و لەبار بێت فرەترمان پێ دەبەخشێ و ڕاژەمان مشەمەرتر پێ دەبڕێ.

بەگشتی سەرەتا ئەرکی پاراستن ڕوو دەکاتە هەموو تاک و توێژێکی کۆمەڵ پاشان ئەرکی ناساندن و پێناسە کردنیش دەکەوێتە ئەستۆی چینی پسپۆڕ و بەرپرسیاری تایبەت. بۆیە ڕەوایە دانیشتوانی سەرزەوی بۆ بەدیهاتنی پێوەندی بەردەوام لەگەڵ ئەم جەماوەرە مەزنە بکۆشن تا سروشتپەروەری لە بیری هەموان بچەسپێنن و بسەلمێنن. کەوابوو تەنیا لە بیری سوود وەرگرتن و بەکارهێنانی سروشتدا نەبین. چونکە هەڵوێستی سوود وەرگرتن وەبێ سوود گەیاندن، هۆکاری پسانی زنجیرەی ئاسایی پێوەندیەکانی سروشتە. بەواتایەکی زۆر ئاسایی وا نەبێت سک تێر کەین و سفرەکە بدڕێنین. لەم سفرەیەدا بەشی هەموومان دانراوە، بۆیە پێویستە بەشی خۆمانیش بەرپرسیار بین و هەست بەم ئەرکداریەش بکەین. هەمی دەزانین کۆی زیندەوەرانی سەرگۆی زەوی بێ ڕوەک بەڕێوە ناچن و ژیانیان بێ ژیست دەبێ.

بنەماڵەی ڕوەک بە شێوەی گشتی و تایبەتی لای خەڵکی ئاسایی و پسپۆڕان بەم شێوەیە دەناسرێ: **گژوگیا، دار و دەوەن، دارچک و چلاک، دڕکوداڵ، گیادەوایی و گیابژار، گیابڕ و گیابۆژان، چقڵ و گوڵ، گوڵی ئینجانە و جوانکاری.**

لە ڕوانگەی پارێزەرانی ژینگە دوو ئەرکی ناساندن و پاراستنی ڕوەک لە سەرووی هەموو دروشمەکانی ژینگەپارێزی و ڕوەکپەروەری سروشتن. سەرجەم سەرچاوەکانی ژینگە، پاژێکی مەزن دەژمێردرێن لە سەنگ و سامانی نەتەوەیی و بۆ هیچ نیشتمانپەروەر و باوەڕمەندێکی ئاینیش ڕەوا نییە لەم ڕێبازە کەمتەرخەمی بنوێنێت.

### ڕێنامەی ئەم ڕێبازە پیرۆزە چییە؟

هەمیشە کورد گوتوویەتی: «کوردەواری بەهەشتی سەرزەوینە». واتا نیشتمانێکە هێندە بژوێن و شیناورد و دارستانە چەشنی ئەو بەهەشتەیە کە باسی دەکرێ. بەڵام ئایا تەنیا بە

پێداهەڵگوتن و هۆنینەوەی دروشم ئەرکی نیشتمانپەروەری و نەتەوەخوازی بەجێ دەهێنرێ و چرۆی خۆشەویستی نیشتمان گەشە دەستێنێ؟ پێویستە هەستی دەروونمان بگەشێنین و چەشنی کار و کردەوە بکەوێتە راژە و گەشەی نیشتمان. سروشت جلکی نیشتمانە. بۆیە شیاوە بۆ جێبەجێ کردنی دروشمی نیشتمانپەروەری مشەمەرترین خزمەت ئاراستەی رووەکی سروشتەکەمان بکەین.

بەڵێ بەراستی جەماوەری نەژاد و جۆری رووەکی کوردەواری نموونەی نمایشت و وێنەیەکی رەنگینی جیهانە و بۆی ئەشێ چەشنی سەرمایەیەکی هەرمان و سوودمەند سەیر بکرێ و بخرێتە بەر زانین و توێژینەوە؛ بەلام سەرەتاییترین ئەرکی پێزانین لە سروشتی کوردستان، ناساندن و پێناسەکردنی هەموو جۆر و شێوەجۆرەکانی گژوگیایە بە زوانی دایکی خۆمان و زوانی خوێندنگاکانمان، هەتا بەرەی ئێستا و داهاتوومان ئەگەر بەنیازی توێژینەوەی زانستی رووەکناسی، رووەکخۆری، هەتوانگەری، گیادەرمانی، هەتوانسازی، شاخەوانی، رووەکپەروەری، گیاپزیشکی، کشتوکاڵی، ژینگەوانی و کیمیا بوون ـ بە ئاسوودەیی لە ئامێزی چیا و دەشتی کوێستان و گەرمێنی سوود وەرگرن و هەست بە سروشتێکی ناسراو و پێناسەداری نیشتمانەکەیان بکەن.

خوێنەرانی هێژا ئێستاکە ئیدی لە دنیا کەمتر شوێن و وڵاتێک بەرچاو دەکەوێ کە سەرژمێری جەماوەری رووەکی نیشتمانەکەیان نەکردبێت. پێناسە کردن و سەرژمێری کردنی رووەک ئەرکی سەرەکی پسپۆڕان و شارەزایانی بواری رووەکناسیە. ئەگەر سروشتی وڵاتێک خاوەنی پەرتووک و پەرگەیەکی تایبەتی بێت بۆ ناسنامە و روونکردنەوە و وێنەداری رووەکەکان، ئەوە نیشاندەری پێگەیشتنی دانیشتوانی ئەو شوێنەیە بە ئاستی پێزانین و رێزلێنان لە سروشتەکەیان. زەنگینی و سەنگینی نیشتمان و کیانێک کاتێ دەرئەکەوێ کە ئاستی سەنگ و سامان و بەربڵاوی زۆر بێت. توخمەکانی پێویست بۆ ئەم زەنگینی و سەنگینیە دەتوانن بریتی بن لە: کانزا، کانیاو، رووبار، سووتەمەنی ژێرزەوی، وزەی تاو و با، سروشتی رەنگین، دەوڵەمەندی بەروبووم، زەوی بەپیت، توانستی گەشتیاری، ئاسەواری مێژوویی و هتد. جا یەکێ لە کارە گرینگەکانی چینی بەرپرس و پسپۆڕ پێناسە کردن و ژمارتنی توخمەکانی سروشتی نیشتمانە. ئایا ئێمە بەتایبەت خوێندەواران و پسپۆڕانی بواری رووەکناسی و کشتوکاڵی ـ هێندە کە شیاو و پێویستی سروشتی کوردەواریە ـ جەماوەری گژوگیای خۆمان ناساندووە و پێوەندی نێوان سروشت و مرۆڤمان پاراستووە؟

ئەگەر چاوێک بە گەشتنامە و بیرەوەری ئەو گەشتیارانە ـ کە بە کوردستاندا تێپەڕیون ـ بخشێنین ئەم راستیەمان بۆ دەردەکەوێ کە تا ئەوڕۆکە گەلی کورد کەمتر ئاوڕی لە تایبەتمەندیەکانی سروشتی نیشتمانەکەی داوەتەوە. تەنانەت دەتوانین بێژین کەسانێکی دەگمەن پێنووس و تێنووسیان بۆ تۆمار کردنی بواری گژوگیای ولاتەکەیان هەڵگرتووە. لەو لاوە زۆربەی گەلان و ولاتانی دنیا دەمێکە ئەم رچەیانە شکاندووە و شاکاریان خولقاندووە.

کەسانێک دەڵێن: ئاخر چارەنووسی گەلی کورد جیاواز بووە و زۆرکات دەسەڵاتدارانی داسەپێنراو لە کوردەواری، پێشیان بە بەرەی بەهاپێدەری فەرهەنگی کوردی گرتووە و سەرخستنی پلەکانی پەیژەی ویژەیی ئەم خەڵکەیان لە ویژەی سەرزارەکی هێشتۆتەوە و ویژەی نووسراوەیان لەڕ و لاواز کردووە. ئەگەرچی مێژوو سەلماندوویە ئەم گەلە هێندەش نەخوێندەوار نەبووە و بۆ ئاخێزی باڵای زیندووی نەتەوایەتی خۆی وێکڕای گەلانی دیکەی دنیا کەمتەرخەمی و تەوەزەلی نەنواندووە. بەڵام ئەمە پرسیارێکە و هاتۆتە ئاراوە: **بۆچی کورد بەم چارەنووسە گیرۆدە بوو؟**

**وەرام:** پاش تێکشکانی دەسەڵاتداری مادەکان، گەلی کورد سێبەری بێدەسەڵاتی میری و کارگێڕی بە سەردا هات. واتا: بە فەرمی نووسین و خوێندنی کوردی کەوتە پەراوێزەوە. پاشان میرانی جێگر و لاوەکی هەمیشە قێز و بێزیان لە مانەوە و گەشەی زوانی کوردی دەکردەوە. لە لایەکی دیکە ئەم گەلە خاوەن فەرهەنگ و پێشکەوتن‌خوازە هەمیشە ویستوویە لە کاروانی پێشکەوتنی مرۆڤ بەجێ نەمێنێ. بۆیە بە ناچاری پێنووسی بۆ فارس و تورک و عەرەب هەڵگرتووە و بەرهەمی ماڵی کورد بە ناوی ئەوان نووسراوە و مۆرکی کوردی لە سەر رووشاوە و بووەتە سامانی بیانی. بۆ دەرکەوتنی ڕاستی ئەم پەیڤە پەرتووکی"ناودارانی کورد" بەرهەمی"بابامەردۆخی ڕۆحانی" هەزاران چیرۆکی ڕاستەقینەی سووتان، فەوتان، ڕزان و تالانی بەرهەمی کەڵەپیاوان و زانایانی کوردستانی هێناوە. ڕەنگە ئەگەر نەهامەتی نەبوونی دەسەڵاتی خۆیی بە سەر ئەم گەلەدا نەهاتبایە، هەنووکە هەزاران پەرتووک و بەرهەمی ناودارانی کوردستان ـکە ئێستە تەنیا ناوێکی رووتیان لێ بەجێ‌ماوەـ لە بەردەستدا دەبوون کە لەوانە بەرهەمێکی کوردی ڕوەکناسی و گیادەرمانی دەبوو.

جا ئەگەر گەلان شانازی دەکەن بە مێژووی لەمێژینەی نووسراوەیی ڕوەکناسی و گیادەرمانیان، ئێمەی کورد نابێ هەست بە لاوازی توانستی فەرهەنگ و زوانەکەمان بکەین. بەڵکوو دەتوانین بە پێچەوانە دەسرە و چۆپی رووسووری هەڵگرین و چیرۆکی پەلەقاژەی پاڵەوانەتی ویژە و فەرهەنگی کورد لە ژێر پاڵەپەستۆی داگیرکاران هەڵوێژین. ئەمە شانازییەکی گەورەیە بۆ بوێری و ورەبەرزی کورد کە زوان و فەرهەنگی تاکوو ئێستا زیندوو ماوەتەوە. ئەڵبەت نابێ ئەم دروشمە خەوپەرچێنمان بکات بەڵکوو پێویستە وەخۆ کەوین و کاری نووسینەوە و کۆکردنەوەی هەموو توخمە فەرهەنگییەکانی سەرزارەکی بەتایبەت پێناسەی ناو و دەرمانی ڕوەک دەست پێ بکەین. برادەرینە کات درەنگە و خەریکە زەنگی کۆتایی دەزرێ و پەیتاپەیتا چینی هەڵگر و پارێزەری فەرهەنگی سەرزارەکی (پیر و زورهانی بەتایبەت دێنشین) مەکۆ چۆڵ دەکەن. جا ئەگەر فریای خۆمان نەکەوین"ئەوە لەتەک کۆچی هەر پیرێک بۆ هەمیشە پەرتووکێکی یەک نوسخەیی کوردی لەناو دەچێ".

ئەگەرچی پێشینیان ئەرکی فەرهەنگی نووسراوەیان نەکرد بەڵام دەستیان لە بەرۆکی وشە و ئەزموونە دەرمانیەکانی ڕەسەن و ڕوەکی کوردەواری بەرنەدا و دەماودەم هێنایان و پاراستیان.

زانایێکی پایەبەرز دەڵێ: ئەو گەلانەی کە نووسینیان نەبووە، بە یاریدەی گۆرانی، هەڵبەست، بەیت و باڵۆرە، هەتوان و تیماری خۆماڵی، پەند و پەیڤی پێشینیان و بابەتە کەلتووریەکانی دیکە ناسنامەی فەرهەنگ و تەنانەت مێژووی ولاتەکەیان ڕاگواستووە. نها نۆگەی ئێمەیە و یادگەی پیرەژنان و پیرەپیاوانی لادێیی و هەوارنشین. خوێنەرینە هەمووو بزانین ڕێبازێکی ئەرکدار و گرانبارە، بەڵام ئاکامی ئەم خزمەتە بۆ پێتاندن و نرخاندنی فەرهەنگ و مۆرکی نەتەوایەتی بۆ هەرمان لە یادگەی مێژوودا زیندوو دەمێنێتەوە.

من هەست دەکەم لەو ڕۆژەوە کە چارەی ئێمە وا لێدرا لە تەنگەلانی کۆساران و پێدەشتانی ناوچۆمان بژین و دەسپێکی ژیانمان لە چیای مانشتی ئیلام سەرهەڵبدا، چارەنووسێکی لێڵ نەبوو بەڵکوو قازانجی خێڵ بوو. ڕووبەری بەرفراوانی کوردەواری لە زاگرۆس و قەندیل هەتا جوودی و شەنگال و کۆبانێ خاوەنی دەیان زاراوە و گەنجینەی فەرهەنگی جیاجیان. ئەم دەوڵەمەندییە بۆ زوان و فەرهەنگی کورد دەتوانێت بە قوڵ هەڵمالین و تێکۆشانی ئێمە، سەدان پەرتووک و بەرهەمی بەنرخ لە ئاستی سەرزارەکی دابەزێنێتە سەر نووسراوە. پیاوان و ژنانی کوردەواری هەمیشە ناوی ڕوەکەکانیان بە بۆنەی ئامانجەکانی گیادەرمانی، ئینجانە، تفاق، گیابرژۆکە و چێشت لە یادگەیان هەڵگرتووە هەتا لە درێژایی هەزاران ساڵەی ژیان، کورد بە کەمترین ئاستی تۆمارکردن و نووسین هێشتا هەر خاوەنی گەورەترین وشەدانی ڕوەکناسی و گیادەرمانی خۆماڵی بێت. ئێستاکەش کەسانێک دەتوانن لەم بوارە سەرکەوتن بەدەس بێنن کەوا پەروەردەی باوەشی کوێستان و بێستانی لادێ بن یان پێوەندی پتەویان لەتەک سروشت و گوندی کوردەواریدا هەبێت.

نووسینەوەی گەنجینەی سەرزارەکی، ئەتوانێ بەڵگەیەکی پشت ئەستوور بێت بۆ بنەمای نەتەوەیی و سەربەرزی هەموو تاکێکی ئەم گەلە بەتایبەت پۆلی خوێندکار و توێژەر. جا کاتێ لە ئالی تێکۆشەرانی لێزان، زۆربەی ئەم گەنجینەیە بوو بە نووسراوە، ئەوە دەبینین ڕۆژبەڕۆژ سوودی زانیارانی دیار و نادیاری ڕابردوو و ئێستاکەمان لە خزمەت ناوچەی خۆمان و خەڵکانی دیکەی دنیا ڕاشکاو و درەوشاوە دەبێت.

خوێندەوارینە! وەرن قوڵی لێ هەڵمالین و ئەم خەباتە پیرۆزە هەڵبژێرین. چونکە دەمێکە زۆربەی گەلانی دنیا ئەم ڕێگەیانە بڕیوە و لە سای زانستی خۆماڵی بە سەرووی هەموو لووتکەکانی زانستی نوێ گەیشتوون. ئێمەیش ئەگەر بمانەوێت بەبێ بنەمای زانستی خۆولاتی ڕێگە بپێوین و بەرەو لووتکەی زانستی سەردەم بڕۆین ئەوە لە سەر بنەما و بە پاڵپشتی زانستی گەلانی دیکە سەر کەوتووین و لە سەر بناغەی ئەلفوبێی زانستی خۆمان دیواری پێشکەوتنمان هەڵنەچنیوە. بە بۆچوونی من ئەم هەستە لە ناخ و دەروونی هەموو تاکێکی کوردا هەیە و تەنیا ڕێبەری دەوێ ڕچە بشکێنێ و ڕێچکە بکاتەوە. کاتێ بە ڕاستەقانی ئەم پەیڤە گەیشتین چێژی کاکڵەی ئەم پەندەی پێشینیان وەردەگرین و خەمی بێخۆ ناخۆین و

راناوەستین و بە ئارخەیانی ئەم ڕێگە پڕپیت و پیرۆزە دەگرینە بەر: «تازە ڕابردوو بورد، فەرموو ئەوە گۆ و ئەوەش گۆڕەپان».

هێژاینە ئەم پەرتووکەی لە بەردەستانە باسی ناونامەی گژوگیای گشت کوردەواری دەکات و بنەمایەکی پێویستە بۆ کارەکانی داهاتوو لە بوارەکانی ڕووەکناسی و ڕووەکدەرمانیدا.

**بەردی بناغەی ڕووەکناسی و ڕووەکدەرمانی دەتوانێ بریتی بێت لەمانەی خوارەوە (بەڕیزەوە):**

- پەیدا کردن و پاراستنی گشت بەرهەمە نووسراوەکانی وڵاتەکەمان
- کۆکردنەوەی ناو و پێناسەی گیاکان لە هەموو گوند و شار و زاراوە و ناوچەکان
- نووسینەوەی هەموو شێوە هەتوان و سارێژەکانی ڕووەکدەرمانی لە پزیشکی خۆماڵی
- پێناسە، ئەزمووننامە و ڕێنامەی حەکیمان و پسپۆڕانی خۆماڵی سەبارەت بە گژوگیا
- ئاستی ڕووەک و بەرهەمەکانی لە ژیانی ئاسایی، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی خەڵکدا

ئەگەر خوا بە یار بگرین و ورەی هەناومان بەرز بکەینەوە، هێندە نابات لە کۆسپی نووسینەوەی گەنجینەی سەرزارەکی ڕووەکناسی و ڕووەکدەرمانیش دەرباز دەبین. ئینجا لە سەر ئەم بناغە پتەوە گەلەخانێ زانستی چێ دەکەین و ئاڵای سەرکەوتن و پێشکەوتن هەڵدەدەین.

ئەورۆکە زۆربەی گەلانی دنیا پاش تێپەڕاندنی قۆناغەکانی سەرەوە، زۆرێک لە بوارانەکانی دیکە و تازەی ئەم زانستانەیان تێپەڕاندووە، وەکوو:

- نووسینەوەی جۆرەکانی ڕووەک بەپێی ناوی زانستی و پۆلێنبەندی ڕووەکناسی
- دابەشکردنی جۆرەکانی ڕووەک هەتا نەژاد، جۆر، ژێرجۆر، تیپ، فۆرم و کوڵتیوار
- پۆلێنبەندی گیا بەپێی مورفۆلۆژیک (وێکچوون و جۆراجۆری گشت ئەندامانی گیا)
- ڕیزبەندی ڕووەک بەپێی فیرۆژنێتیک (وەکوو ئاڵوگۆڕی مولوکوولی سەر دەنکی هەڵاڵەی گوڵەکان)
- بژاردنی مولوکوولە تایبەتیەکانی ڕووەک بۆ ئامانجی زانستی (وەکوو دۆزینەوەی مولوکوولی تایبەت بۆ نەخۆشی)
- دەسنیشان کردنی تایبەتمەندیە ژنێتیکیەکانی گیا لە ئاستی نەژاد تا فۆرم و کوڵتیوار
- دۆزینەوەی پێوەندی و ئاوڕدانەوەی (زوانی فیزیۆلۆژیک) جۆرەکانی ڕووەک بەرانبەر ژینگە و هاوجۆرەکانی دیکەی ڕووەک
- بەدەسهێنانی پێوەندی نێوان جۆری کێوی و کشتوکاڵیی ڕووەک
- دەرهێنانی ئاوتک، بۆن، ڕۆن، جەوی، شیلاوە، شیرە، تۆم، توێکڵ، تووڵ و هاڕاوەی ڕووەک بۆ مەبەستی خواردن، هەتوان، جوانکاری و پیشەسازی.

## پێشینەی گیاناسی لە کوردەواری

ئاشکرایە ئەوسا پسپۆڕان و شارەزایانی ڕووەک، سەرەتا ڕووەکناس بوون پاشان چوونەتە ناو بوارەکانی دیکە وەکوو گیادەرمانی، گیاخۆری و گیاپەروەری. بەڵگەی ئەم پەیڤە لە گەنجینەی بەنرخی پزیشک و حەکیمی گەورە (ابوعلی سینا)دا لە بەردەستە. ئەم بژیشکە هەرەلێزانە پەرتووکی دووهەمی (قانون در طب)ی بۆ گیاناسی و شیکاری ڕووەکە دەرمانیەکان داناوە. تەنانەت ئەگەر سەیری کارنامە و ژینامەی حەکیمان و بژیشکە خۆماڵی و دێنشینانی کوردەواری بکەین، دەبینین زۆربەیان لەپێشدا سەرجەم گیای گوند و ناوچەکەی خۆیان ناسیوە، پاشان بە یارمەتی ئەم ڕووەکانە پرێسکەی دەرمانییان ئاخنیوە و لە نووسینگەی بژیشکی و دەرمانگەرییان بەکاریان هێناوە. ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە بۆی داچین، دەتوانین خۆشبینانە دانوسان لەتەک شوێنەوارەکانی بەجێماوی پێشینیان ـکە زۆربەیان سەرزارەکین و نەنووسراون ـ بکەینەوە.

ئەوسا لە هەموو جێگەیەکی ئەم وڵاتە بەتایبەت لادێیەکان خەڵکی خۆیان لە فێر بوون و هەڵگرتنی دەرمان و هەتوانی سروشتی نەدەبوێرا. تا ئەو ئاستەی لە سەرەپیریدا بەتایبەت ژنان، دەبوون بە گەورەترین گیاناس، سارێژکار و هەتوانسازی سروشتی. هەروەها لە هەر گوند و ناوچەیەک کەسێکی سەرباشقە بە ناوی حەکیم، کارە گەورە و گرانەکانی دەرمانی ئەنجام دەدا و ڕووەکە گرینگ و دەگمەنەکانیشی بە جوانی دەناسی و بەکاری دەهێنا. بەڵام ئەوڕۆکە زانستی نوێ و داسەپێندراوی دەرەکی بە سەر هەموو لایەنی ژیانمان وایکردووە خەریکە ئەزموون و گەنجینەی هەزاران ساڵەی پێشینیانمان لە بیر بچێتەوە. ئەگەر هێمان کەسانێ خۆیان لە پاراستن و درێژەدانی ئەم ڕێچکە بناغەدارە نەتەکاندووە و بەخۆڕایی کاری دەرمان و هەتوانی کوردیاتی دەکەن، لە بەرانبەردا هەندێ یار و نەیار بەم کەلەپوورەی کوردەواری بە تەشقەڵە و تیتاڵی پێ دەکەنن و سەرناوی نەخوێندەوار و دووکتەر بان قووڵینەیان پێ ئێژن. جا ئەمەیە ژانی ناسۆر و کاریی لە سەر پەیکەرەی فەرهەنگی کوردستان بەتایبەت مژاری پاراستن و ناساندنی گیادەرمانی خۆماڵیی کوردەواری.

ئەگەر تێ نەکۆشین هێورهێور ئەو کەسانەی ناوی ڕەسەنی گژوگیای کوردەواریان لە بەر دەکرد و گیاناس و گیادەرمانی بەنرخی خۆوڵاتی بوون، کۆچ دەکەن و کەسانی بێبەرپرس و گەمەجاڕی ئەم بوارە سەر هەڵدێنن و لە پشتیانەوە ڕێچکە دەبەستن.

گەلۆ! پێویستە وەخۆ کەوین و بەرەیکی کارامەی لەخۆبردوو ساز بکەین و بەرانبەر بەم ڕێچکە مەترسیدارە ڕاوەستێ و بوێری نیشان بدا و پوختە و گەوهەرەی تێکۆشانی خۆی بکا بە گەورەترین و کاریگەرترین بەرگر بەرامبەر بە فەوتانی پێناسەی نەتەوایەتی.

هۆیەکی هەرەگەورەی هاندەر بۆ نووسین و کۆکردنەوەی ئەم پەرتووکە، هەستی لەبیر چوونەوە و کەمتەرخەمی بەرامبەر فەرهەنگی ڕووەکناسی لە ناو جەماوەری کوردەواری بوو.

ئەگەرچی کەڵەپیاوانێ وەکی میرزا سدیق چنگیانی، نوورەدین سەدرەدین، سەید شەهابی خزری، کەمال جەلال غەریب، ئەمیر ئەمینی، ساڵح سروشت، هەردەویڵ کاکەیی و هتد، ناوی گەلێک ڕووەکیان لە بەرهەمەکانیان تۆمار کردووە و لە فەوتان ڕزگاریان کردوون، بەڵام تەنیا ناوەرۆکی ئەم پریسکانە وەرامی هۆگران و خوێندەوارانی ئەم سەردەمەی کورد نادەنەوە. واتا پێویستە کەسانێک بینە پردی پێوەندی نێوان ئەزموون و هەبانەی پێشینیان و زانستی هاوچەرخ. ئەگەر خوێندکارێکی کورد ڕێچکەی چەند بواری توێشەی حەکیمان و گیادەرمانانی خۆماڵی، زانستی ڕووەکناسی سەردەم و هەبانەی وشە و دەستەواژەی پەرتووکەکانی کوردی بخاتە سەر یەک ئەوە دەتوانێ ماجوومێکی نوێ بگرێتەوە و پیشانی بەرەی هاوچەرخی بدات و ئەوانیش پاڵ بدەنە کار و ئەزموونی پێشینیان و بەرهەمی خۆیان ئاراستەی کاروانی زانستی مرۆڤ بکەن. بەختەوەرانە ئەم چرایە خەریکە تین دەگرێ و بەرەو ڕەوینەوەی تاریکیەکانی ئەم بوارە دەچین. بەو هیوایە ڕۆژێک دابێ گشت خوازیاران و لایەنە پێوەندیدارەکانی کوردەواری لە بەر ڕووناکی ئەم چرایە بنووسن و بخوێنن و بەرهەم بنوێنن.

### ڕووەکناسان و گیادەرمانانی مێژووی کوردەواری

هەر وەک گوتمان، بەداخەوە بەشی نەتەوەی کورد لە گەنجینەی مێژووی پەرتووکی گیاناسی و گیادەرمانی چۆلە و ـناشوکری نەبێت ـ بەهرەی کەمی پێ براوە. ئەگەرچی ناوەرۆکی پەڕاوە مێژوویی‌ەکان و یادگەی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری ڕوونی دەکەنەوە؛ کوردستان هەمیشە نشینگەی پیاوان و ژنانێک بووە کە پێوەندیان لەگەڵ سروشت و ژینگەکەیان نەپچڕاندووە و بە یارمەتی ناسینەوە و بەکارئانینی گیاکان، بە سوود و قازانجی خواردن و دەرمانی گەیشتوون و ڕەنگە دەیان پەرتووکی ڕووەکیشیان نووسیبێت، بەڵام هەر وەکوو مێژووی ناودارانی کورد دەڵێ: هەموو یان زۆربەیان فەوتاون و تەنیا نێوێکیان ماوە. ئەگەریش زۆر هێڤیدار بین ئەوە بەرهەمەکانیان بە کوردی نەنووسراونەتەوە و لە نمایشتی مۆزەخانەی هەندەرانە یان سووچی ڕزانی میراتبەران.

### نموونەی ڕووەکناسان و گیادەرمانانی مێژووی کوردەواری:

- ئەبووحەنیفەی دینەوەری (۳۰۰ کۆچی) گیاناس و گیادەرمانی ناوچەی دینەوەری کرماشان و خاوەنی بەرهەمی"کتاب‌النبات"
- ئیبنولکوردی شارەزووری (۷۸۱ کۆچی) خاوەنی نووسینگە و پریسکەی پڕ ئەزموونیگیاناسی و گیادەرمانی لە شاری مەککە
- شەمسەدینی سنجاری (شەنگالی) (۸۰۰ کۆچی) بژیشک و گیازان و نووسەری بواری گیادەرمانی دانشتووی قاهیرە
- مامۆستای هۆنەر سەیدی هەورامی (۱۵۰۰ زایینی) یەکێ لە پزیشکانی بەناوبانگی گیادەرمانی دەڤەری هەورامان

- عەلائەدینی تەبیبی هەولێری (١٠٠٠ کۆچی) خەڵکی حەڵەب لە ڕۆژاوای کوردستان
- زەکی ئەفەندی سۆرانی (١١٠٠ کۆچی) زانای ڕوەک و حەکیمی ناوچەی سەردەشت خاوەنی نامیلکەی (مختصر قانون در طب ابن‌سینا)
- نۆژدار سمایل حەکیم سلێڤانی دهۆکی (١٨١٠ ز.) گیادەرمانی لێزان لە ناوچەی بادینان، خاوەنی پەرتووکی گیادەرمانی "گیابەند"
- حاجی عەلی ئەدیب بۆکانی (١٢٩٥ هـ.) حەکیمی تایبەتی نەخۆشیەکانی پێست، ئێستاکەش ماڵباتی ئەم حەکیمە یەکێ لە هەتوانەکانی بە ناوی "مەڵهەمی ئەدیب" داوەتە بازاڕی پزیشکی دنیا. ئەم مەڵهەمە خاوەنی مۆڵەتی تەندروستی ئێرانە و مەدالیای برۆنزی ئاڵمانی وەرگرتووە
- ماڵباتی سەید ڕەحمەتی باینچۆی سنە بەتایبەت سەی حەمە حەکیم (١٣٥٢ کۆچی)
- شێخ عەولای هەزارکانیانی پسپۆڕ و خوێندەواری هەموو پەرتووکەکانی گیاناسی و گیادەرمانی سەردەمی خۆی تا ساڵی ١٣٥١ کۆچی، دانشتووی گوندی هەزارکانیان لە ناوچەی سارالی دیواندەرە
- شێخ عەلادینی نەقشبەندی تەوێڵە و شێخانی بیارەی هەورامان
- ماڵباتی حەکیمانی گوندی سەبەتلووی بانە
- ئەشرەفولحوکەمای سنە و بنەماڵەی ئەلیاسیەکان
- مەلا خدری ڕواری هەورامی خاوەنی پەرتووکی "ئێقباڵنامە" کە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس لە هۆنراوەی هەورامیانە کردوویەتیە سۆرانی
- حەکیم حاجی برایم خاوەری ئاساوڵەیی لە شاری کرماشان
- شێخ عوسمانی نەقشبەندی دووڕۆ لە ناوچەی سەوڵاوا
- شێخ موحەممەدی نەقشبەندی سوورکەوڵ لە ناوچەی کۆماسی مەریوان
- حەکیمە کۆڵەی گردەکشانێ لە ناوچەی دەشتی لاجانی پیرانشار
- گیادەرمان و پزیشکی خۆماڵیی کوردەواری (KTM: Kurdish Tradishnal Medicen) کاک بورهان حوسەینی لە ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە
- گیادەرمان و وەبەرهێنەری گیایی خەیاڵ عەبدولازادە خەڵکی گوندی هەمزاوای مەهاباد، کەسایەتی ناسراو و بلیمەتی کۆمەڵەی ژنان و بەتایبەت بەرهەمهێنەرانی ناوچەکە و تەنانەت گشت ئێران

## ئاستی ڕوەک لای خەڵکی کورد

پەرتووکی (گیاهان دارویی) ئەمیر ئەمینی بە گێرانەوە لە سەرچاوەکانی مێژووی کەونارای ئێران و گەلانی هەرەمێژینەی ناوچەی ناوچۆمان بەتایبەت دەسەلاتدارانی ماد و ئاسووری، ناو و یادگاری کەسانێکی بژیشک و گیاناسی وەکی «حەکیم نەمری و نیشان»ی

هێناوە. سەردەمی ئاسووریەکان نیشتمانی ماد بە ناوی بژیشکی کورد «نەمری» دەناسرا. نووسینگە و نەخۆشخانەی ئەم بژیشکە هێژایە شاری کەونینەی سازان (پاوەی ئەمڕۆکە) و ئالان (ناوچەی باشووری سەردەشت) بووە. هەندێ لە مێژوونووسان وەکوو دیمورگان و هێرۆدوت ناوی ئەم دوو شارەیان لە ئاسەوارەکانیان هێناوە. لە ئاکامی شەڕ و ئاژاوەکانی دوو وڵاتی کۆنی ماد و ئاسووری، حەکیم نەمری ویکڕای هەموو نووسراوە و بەرهەمەکانی دەگوازرێتەوە بۆ ناوەندی دەسەڵاتداری ئاسووریەکان. هەروەها لە هێرشی سارگۆنی دووهەم بۆ سەر مادەکان، دانیشتوانی کوردستان دەڕفێندرێن بۆ لای هێگمەتانە و حەکیم نیشانیش بە نووسینگە و نەخۆشخانەیەوە دەبرێت بۆ پێتەختی ئاسوور. ئەم پسپۆڕە مەزنە گەلەک هەتوانی لە ڕوەکی گوڵنیشان بەدەس هێنابوو.

ڕۆژگاری ئیمپراتوری ماد ڕوەکی سێوەخووگانە زۆرترین ئاستی هەناردەی بۆ وڵاتانی دراوسێ هەبووە. حەکیم نەمری لە گوشراوەی گوڵەدەوری، هومێو و هەسەبەگی هەتوانێکی بە ناوی «سارێژ» چێ‌کردووە کە بازرگانانی ماد بۆ وڵاتانی ئاسوور، ڕۆم و یونانیان هەناردووە. لە دۆزراوەکانی شوێنەوارە بەردینە و سوالەتیەکانی لای مووسڵ ڕاستی ئەم قسە دەرکەوتووە. مێژوونووسی فەرانسەوی دیمورگان نووسیویە یەکەم جار حەکیمی ماد بە ناوی«تائێل» لە دەسەڵاتداری ئاسووریەکان بۆ دەرمانی زەردۆیی و لاڕەشە لە داری تایلە کەڵکی وەرگرتووە. ڕەنگە نزیکایەتی وشەی تایلە لە زوانی کوردیدا و ناوی تائێل هەر بەم بۆنەوە بێت.

مێژووی گشتی جیهان دەگێڕێتەوە: سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵی و نرخاندنی ڕوەک لە ناو ژیانی مرۆڤەکاندا لە ناوچەی ناوچۆمان ـچوار بەشی کوردستانی ئەوڕۆکە و هێندێ سنووری وڵاتانی دراوسێـ دەستی پێکردووە. چاندنی تۆمی گیاکان بەتایبەت گەنم و هێنانە ناو گەردوونەی ژیان لە لایەن دانیشتوانی مەڵبەندی ناوبراو، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای چەرخی شارستانیەت و فەرهەنگی کشتوکاڵی و سروشتپەروەری. ئێستاکەش لە سای گشت ئایینیەکانی کورد و پەیامە بەرزەکانی شارستانیەتی گەل، کوردان چەشنی بوونەوەرێکی زیندوو لەگەڵ ڕوەکدا دانوسان دەکەن و نرخی بەرزی زیندەواری بۆ دادەنێن.

بەپێی پێشینەی فەرهەنگی ئابووری و کشتوکاڵی گەلانی دنیا، ڕوەک دەتوانێ چەشنی نیشانە و هێمایەک بێت بۆ پێناسەی هەر نەتەوەیەک. بۆ نموونە خورما لای عەرەب، پستە لای فارس، برێنج لای گیلەک و مازەنی و ئەنبە لای هێندیەکان. سەبارەت بە نیشانەی سروشتی بۆ نەتەوەی کورد ـ بە حوکمی دابەشبوونی کوردستانـ سپیدار و دارتوو دانراوە. جا لەمەڕ سەلماندنی ئەم دوو دارە نموونەی دوو چیرۆک لە بەر دەستدایە. سەردەمی شالاوەکانی ئەنفال بۆ سەر کوردانی کەرکوک، سەدام فەرمانی دەرکرد بە عەرەباندنی جلک و دیمەنی ئەم شارە. یەکێ لە کاولکاریەکانی ڕژێمی بەعس بڕینی داری توو و گوێز و چاندنی نمامی خورما بوو. چیرۆکی دووهەم ساڵی ٢٠١٢ باژێرڤانی دیاربەکر لە پەیڤێکدا ئاشکرای کرد بۆ پیشاندان و سەلماندنی ڕوخساری کوردی شارەکەیان، دەستیان داوەتە ناشتنی سپیدار لە کەناری شەقام و

گۆڕەپانی باخەکانی ناوشار هەتا دیمەنی کوردی سەقام بگرێتەوە لە جێی تابلۆی تورکیی باکووری کوردستان.

لە سەربهوردی ئێزەدیەکاندا هاتووە: کاتێ نەیاران هێرشیان هێنایە سەر شوێنکەوتوانی شێخ عودەی، گەلێک پێشەوا و خەباتکاری ئێزەدی لە مووچە و کێڵگەکان کوژران. لەو کاتەوە ئێزەدیەکان لە خواردنی«کیوەر، کەلەرم و لووبیا» خۆ دەپارێزن و چەشنی بەرهەمی پاوانە بۆیان. هەروەها پەرتووکی (دائرەالمعارف مذاهب) دەریخستووە پێغەمبەری سەرەکی ئێزەدیەکان ناوی خاسیە بووە ولەگەڵ ڕوەکی خاس (کیوەر) هاوناوە. هەرچەن پەیڤێکی‌تر لە دەستەی ئێزەدیانی مەلەکەتاوس‌ویست هەیە کە لە چێشتی مجێوری مامۆستا هەژاردا باسی کراوە: ئەو کاتەی بابادەم بە هۆی شەیتانەوە دەرکرایە سەرزەوی و خوا لە شەیتان ڕەنجیا، شەیتان لە بن چڵێکی کیوەر خۆی شاردەوە بەڵام کیوەر گەڵای هەڵدایەوە و ئاشکرای کرد.

دۆزراوەکانی سواڵەتی شنۆ و زیویەی لای سەقزیش دەریدەخەن کە ڕوەکی «گوڵەبەرۆژە» بۆ خەڵکانی دانشتووی ئەو ناوچەیە نیشانە و دروشمی ڕووناکی و پشت بەستن بە کشتوکاڵی بووە. هەروەها مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە سووتاندنی تووی «قانگ و خەربەنگ» نەریتێکی کۆنی کوردەواریە و لە باوڕەکانی ئایینی زەرتوشتەوە بەجێ ماوە و کاتێ نوێژخوێنان و نزاکاران دەچوونە ئاتەژگە، لەگەڵ خۆیان تۆمی قانگ و خەربەنگیان دەبرد و لە سەر کڵی ئاگریان دەپرژاند. جا باوڕیان وابوو بە هۆی دووکەڵی ئەو ڕوەکانە ئەهریمەن دوور دەکەوێتەوە. لە پەرتووکی (نفحات‌الانس)ی جامیشدا هاتووە: کوردەکان بۆ هەتوان و سارێژی برین و زیپکەی کاریی، بەرهەمێکیان بە ناوی «نەجار» لە کوتراوەی تووی قانگ و ڕۆنی زەنگ چێ کردووە. تەنانەت حەمزە برای سڵتان سەهاکی پیر و ڕێبەری یارسانەکانیش بە بازرگانی نەجارەوە خەریک بووە.

ژێدەری کەونارای مێژووی ئێران دەگێڕێتەوە: مانی نیگارکێش و پێغەمبەری ئێرانی، شەوێک لە خەویدا فریشتەیک چڵێ «ڕەشە ڕێحانە»ی پێ دیاری دەکا. بەیانی دەسبەجێ دەست بە کێشانی وێنای خەونەکەیدەکا و لە سەر ڕووپەڕی بەرگی کۆپەڕەکەی (ئەرژەنگ) دایدەبەزێنێ. ئێستاکە شوێنکەوتوانی ئایینی مانی لە چیاکانی شەنگال و مووسڵ ماون و بیرەوەری ڕێحانەیان هێشتا لە بیر ماوە. بە گوێرەی ژێدەری (تقویم الابدان) کاتی هێرشی ئێسکەندەر بۆ سەر دەڤەری خانێ، سەربازان بۆ بەهێز کردنی وورەی خەباتکاریان تووی ڕوەکی «پێچن»یان دەخوارد چونکە پێچن توانەی پزیشکان و حەکیمانی ئەو سەردەمە بوو.

مێژوونووس گیرشمەن دەڵێت: لە سەردەمی ساسانیەکاندا کوردانی تەنیشت ئاورگەی شیز لای سەقز و بۆکان، بۆ ساز کردنی هەتوانی نەخۆشی نۆگە (مالاریا) هومار و کۆگاکانیان لە توێکڵی جۆرەکانی داربی ئاخنیبوو. هەروەها هێزەکانی ماد لە شەڕی سارگۆنی دووهەم بۆ بەرگری لە نۆگە و تاوبردوویی ڕوەکی وەردینەیان دەخوارد یان مێژووی ئەشکانیەکان

دەگێڕێتەوە: لە کاولکاریەکانی ڕۆم لە کوردەواری، پاشای ئازا میهرداد دووهەم ئەگاتە فریای کوردەکان و ئەوانیش تاجەگوڵینەیک لە «گوڵی وەنەوشە»ی پێ دیاری دەکەن.

ساڵی ١٣٢٤ هەتاوی لە هومبەیەکی پڕ لە هەرزن لە ناو گۆڕە کەونینەیکی هەوراماندا بەڵگەیک دۆزرایەوە ـکە مێژوونووسان ئێژن: کۆنترین بەڵگەیە بۆ زوانی پالەوی ئەشکانی. ئەم بەڵگەیە لە سەر چەرمی گا نووسراوە کە قەباڵەی دانوسانی پارچەیکی «ڕەز» بە کەرەستەی ئاوداشتنی گۆزەییە و چەند وشەی کوردیشی تێدا بەجێماوە. مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٢٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا. جا ئەگەر لەم دەسکەوتە بەنرخە ورد بینەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئاستی کشتوکاڵی ئەو سەردەمە چەندە بەرز بووە کە شێوازی ئاودێری و پاراستنی باخ و ڕەزیان لە چ ئاستێکدا بووە. هەروەها باسێک هەیە لە سەر پزیشکی گەورە ـئەبووعەلی سینا. کە بێهۆ نەبووە سەرەڕای دەرباری سامانیان، نووسینگە و تاقیگەی لە بوخاراوە کۆچاند و نیشتمانی خۆی بەجێ هێشت و لە تەنیشتی خاکی کوردانا لە هێگمەتانە گیرسایەوە. لە دەسپێکی وەرگێڕانی کتێوەکەی (قانون در طب)، مامۆستا هەژار نووسیویەتی: شوێن پێی زوانی کوردی و کاریگەری سەردانی نەخۆشانی کورد بۆ لای ئیبنەسینا لە بەرهەمە عەرەبیەکەیدا زۆر بەرچاو دەکەوێت.

***

### پێگە و زانستی ڕووەکناسی

ڕووەکناسی یان زانستی گیایی یەکێ لە لقەکانی زانستی ژیناسیە و دەپەرژێتە سەر توێژینەوە و خوێندنەوەی گیاکان. بەواتایەکی دیکە سەرقاڵی ژیان و گەشە و کاریگەری ڕووەکەکان دەبێت کە ئەم جەماوەرە بناسێت، لە بواری ژیان و گەشە کردنیان بکۆڵێتەوە، هەڵوێست و لاکردنەوەی گیا بەرانبەر ژینگە و زیندەوەران نیشان بدات و لە هەموو گرینگتر پێوەندی ڕووەک لەگەڵ ژیان و بژیو و هەتوانی مرۆڤ لێک بداتەوە و ئەنجامی پێویست پێشکەش بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بکات. ئەم زانستە گەلێک لقوکەی وەکوو تاکسۆنۆمی (پۆلێنبەندی)، مۆرفۆلۆژی، فیزیۆلۆژی، هەڵاڵەناسی، گیاپزیشکی، ژنێتیکی گیایی، کوارگناسی، قەوزەناسی، سیتۆلۆژی، ژینگەناسی گیایی و گیادەرمانی لێ جوێ دەبێتەوە.

سەرەتا با لاپەڕەیەک هەڵدەینەوە لە ئەنجامی توێژینەوەی زانایانی بایۆلۆژی (ژیناسی) کە سەبارەت بە بازنەی بوونەوەرانی زیندووی جیهان دەریان خستووە. زانایان سەرجەم زیندەوەرانی ورد و درشتی دنیایان لە پێنج ئاستدا پۆلێن کردووە:

١- ئاستی Monera: مۆنێراکان خاوەنی پێکهاتەیەکی تەکخانین و خانەکانیان ناوکیان نییە. ڕێژەی ئەمانە لە هەموو زیندەوەرانی دنیا زۆرترە و دابەش دەبن بە بەکتریای ئەرێنی و نەرێنی. بەکتریا ئەرێنیەکان ئەوانەن کە بۆ ژیانی بوونەوەرانی دیکە سوودمەندن و بە هەموو شێوە لە چێشت و خۆراکەکاندا هەیە یان هۆکاری سەرەکی

شیکردنەوە و توانەوەی زبڵ و پاشەڕۆ و خاشاکن. بەکتریا نەرێنیەکانیش ئەوانەن کە دەبنە هۆی دروستبوونی نەخۆشی. ژمارەی بەکتریاکان ٥ تا ١٠ ملیون دانە خەملێندراون. لە بەکتریاکانیش بوونەوەری بچووکتر وەکوو ڤایرۆس هەن، بەڵکوو ئەمان لە ئاستی زیندەوەراندا پۆلێن ناکرێن. چونکە بۆچوونی زۆربەی پسپۆڕان ئەمەیە کە ڤایرۆسەکان پارچەیەک لە (RNA) یا (DNA)ـە و خۆیان لە پۆشەنێکی پرۆتەییدا گرتووە. واتا چەشنی بەکتریا یەکەی خان نین بەڵکوو پارچەیەک خانن.

٢- ئاستی Protists: ئەمانەش چەشنی مۆنێراکان تەنیا خاوەنی یەک خانن بەڵام خانی پرۆتیستەکان ناوکیان هەیە و زۆرتر ئاوژین وەکی ئامیب، قەوزە و پارامسی. قەوزە بەتایبەت قەوزە سەوزەکان دەتوانن چەشنی ڕوەکە پێشکەوتووەکان بەهۆی پێکهاتەی (Clorophyll) فتۆسەنتز بکەن و ئۆکسیژن و چێشتەمەنی بەرهەم بهێنن. پتر لە ٨٠٠٠ جۆر لەم ئاستەدا تۆمار کراوە.

٣- ئاستی کوارگەکان (Fungi): کوارگ لە کۆگای خانەکانەوە بە ناوی هیف گەشە دەکات. کوارگەکان بەگشتی شێوازێکی تاڵئاسایان هەیە و چونکە پێکهاتەی فتۆسەنتزیان نییە پێویستە خۆیان بکەن بە لاکوت و مشەخۆر بۆ دروستبوونی نەخۆشی یان لەگەڵ مایکۆرێزا و کرێژەبەردەکاندا هاوژین دەبن و چێشتەمەنی و ئاوی خۆیان دابین دەکەن، هەروەها بە شێوازێکی دیکە واتا ساپرۆفیت خۆیان بە تەن و لاشەی بێگیان و مردووی گیا و بوونەوەرانی دیکە دەچەسپێنن و ئاو و چێشتەمەنیان وەردەگرن و لە ئەنجامدا ئەوانیش شی دەکەنەوە. دەستەی کوارگە خۆراکی و ژەهراویەکان لە ئەنجامی ژیانی ساپرۆفیتیە. ژمارەی سەرجەم کوارگە میکرۆسکۆپی و ماکرۆسکۆپیەکان ٧٤٠٠٠ تا ١٢٠٠٠٠ دانە بەراورد کراوە، ئەگەرچی ڕێژەی کوارگە ماکرۆسکۆپیەکان (خۆراکی و ژەهراوی) تا ١٦٠٠٠ جۆر گەیشتووە.

٤- ئاستی ڕوەکە پێشکەوتووەکان: پێکهاتەیەکی جیاوازە لە دەستەیەکی هەرەزۆری خانەکان کە تایبەتمەندی سەرەکیان کلۆرۆفیل (کارگەی فتۆسەنتز) و ڕیشە و گوڵ و لاسکە. ئەم دەستەیە دەتوانن ئۆکسیژن ($O_2$) و چێشتەمەنی خۆیان و زیندەوەرانی دیکە بەهۆی ئاو و ($CO_2$) بەدەست بێنن. تا ئێستا ژمارەی ڕوەکەکان ٢٩٧٣٢٦ دانە بەراورد کراوە. هەر چەند ڕوەکناسان بەردەوام جۆری تازە پتر دەکەن بەم ژمارەیە.

٥- ئاستی گیانەوەران: پێکهاتەی ئەم ئاستەیەش چەشنی ڕوەکەکان خاوەنی دەستەیەکی زۆر لە کۆگای خانەکانە، بەڵام لێرەدا گەلێک پێشکەوتن بەرچاوترە لە ڕوەکەکان. واتا بۆ مانەوە پێویستیان بە خواردنە لە زنجیرەکانی دیکە و هەروەها خاوەنی کۆندامی دەمار و دەروونین. ژمارەی ئەم ئاستە ١٢٦٣١٨٦ دانەیە.

بەگشتی تاکوو ئێستا ژمارەی تەواوی زیندەوەران لە سەرجەم ئاستەکانی سەرەوە بە دەست نەهاتوون. هەر ساڵ نزیک بە ١٠٠٠٠ جۆر زیندەوەری ورد و درشت دەدۆزرێنەوە.

زانایان پێشبینی دەکەن ژمارەی گشت زیندەوەرانی سەرگۆی زەوی لە نێوان ١٥٠٠٠٠٠ تا ٨ ملیۆن جۆر - بێجگە لە بەکتریاکان- بێت. ئەڵبەت ئێستاکە نزیک بە ١٨٠٠٠٠٠ جۆر بینراوەتەوە و پێناسە کراون. هەر لە دەسپێکی ئەم سەدەیەدا پسپۆڕان توانیویانە ساڵانە نزیک بە ١٧٥٠٠ جۆر ناونووس و پێناسە بکەن. ئەگەرچی کاتی پێناسە کردنی جۆرەکان دووبارەکاری زۆر دەکرێت، چونکە جاری وایە بۆ یەک جۆر چەندین ناو ڕیز کراوە. ئەمە وایکردووە ژمارەی جۆرەکان هەمیشە بان و خوار بکەن. هەر چەند تا ڕادەیەکی زۆر شێوازی ناونیانی زانستی لینە پێناسە و ژمارتنی جۆرەکانی ئاسان کردووە و دووبارەکاری دابەزاندووە.

**زانستی پۆلێنبەندی (Taxonomy) ڕووەکناسی**

ئەگەر گەرەکمان بێت جۆرێک ڕووەکی دیاریکراو بناسین پێویستمان بە کۆمەڵێک نیشانە و دروشم و پەسنی بەرچاو هەیە. تاکوو لەگەڵ جۆرەکانی دیکە یان هاوجۆری نزیکیدا بە هەڵە پێناسە نەکرێت و ناسینەوەی بۆ ڕووەکناس و کەسانی دیکە ئاسان بێتەوە. مەبەست لە پێناسەی جۆرێکی ڕووەک، جیاکردنەوەیە لە جۆرەکانی دیکە. کەوابوو بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هەنگاوی یەکەم و ئاسانترین شێواز، پۆلێنبەندی ڕووەکەکانە بە گوێرەی نیشانە و تایبەتمەندیە هاوبەشەکان کە ئەمانە بنەما و بنەچەی زانستی پۆلێنبەندیین.

لەو کاتەیەوە کە مرۆڤ دەستی کرد بە خواردنی ڕووەکەکان، جیاوازی ڕووەکەکانی لە ڕەنگ، بۆ، بەرزی، نەوی، تاڵی، شیرینی، ترشی، ژەهراوی و هتد هەست پێکرد. هەروەها بە سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵی، مرۆڤ توانی ڕووەکەکان بە شێوازێکی زۆر گشتی دابەش بکات بە خواردن، دەرمان، جوانکاری و ژەهراوی. یەکەم کەسێک کە هەندێک پێشکەوتووتر گیاکانی پۆلێن کرد و بە باوکی ڕووەکناسیش دەناسرێ (Theopherast) شاگردی ئەفلاتوونی حەکیم بوو. تێئۆفراست سەردەمی خۆی (٢٨٠ پ. ز) ٥٠٠ تاکسۆن ڕووەکی بەپێی شێوازی (دار، دارچک، دەوەن، بنچک) و تایبەتمەندیەکانی میوە و گوڵ، لە پەرتووکچەی بەناوی (Historia Plantarum) نووسی. پاشان لە سەدەی یەکەمی زایینیدا پزیشکی یۆنانی (Dioscrides) لە ٦٠٠ تاکسۆندا ڕووەکە دەرمانیەکانی نووسیەوە و لە پەرتووکێکدا بە ناوی (Materia medica) تۆماری کرد. هەروەها ساڵی ١٦٢٧ زایینی زانای بریتانیایی (Jay Ray) ١٨٠٠ جۆر ڕووەکی بەپێی ژمارەی (Cotyledon) پۆلێنبەندی کرد.

ئەگەرچی تا سەردەمی پاش (Jay Ray) ڕووەکناسی بە ئاستی پۆلێنبەندی نەژاد نەگەیشتبوو، بەڵام (Tourenfort) یەکەم کەس بوو ساڵی ١٦٦٠ ڕووەکەکانی لە ئاستی نەژاد پۆلێن کرد. ئەم ڕووەکناسە ٢٢٠ ڕیز، ٧٠٠ نەژاد و ٩٠٠٠ جۆری خستە ناو خشتەی پۆلێنبەندی ڕووەکناسی. ئەنجامی پۆلێنبەندی بە گوێرەی دەستەی گوڵپەڕەی یەکپارچە، گوڵپەڕەی جیا و بێ گوڵپەڕە -کە هێشتا بەکار دەبرێت- بیرۆکەی تۆرێنفۆرت بوو.

تا سالی ١٥٧٦ هەندێ سەرچاوە و پەرتووکی ڕووەکناسان و کەسانی دیکەی ئەو سەردەمە و پێشتر، تەنیا باسی کۆمەڵێک کەمی ڕووەکی کشتوکاڵی یان گژوگیای ژینگە و ناوچەیەکی بەرتەسکیان کردووە ئەویش تەنیا بە شرۆڤەیەکی سادە لە ڕواڵەت و تایبەتمەندی ڕووەکەکان. ئاشکرایە ئەورۆکە ئەگەر لە سەر بنەما و ڕێچکەیەکی تایبەتی یان پاڵپشت بە بیرۆکەیەکی دیاریکراو کاری ناساندن و هەڵاواردن نەکرێت، ئەم هەمووجۆر و ڕەنگاوڕەنگیەی ڕووەکەکان بە دروستی و تۆکمەیی جیا ناکرێنەوە. ئەگەرچی لە سەرچاوە کۆنانەدا هەندێ گەڵاڵەی سەرەتایی بۆ هەڵاواردن بەرچاو دەکەوێت، وەکوو دەستەی ڕووەکە چەتریەکان، گوڵ ئەستێرەییەکان، پوونگەکان و هتد، بەڵام ئەم هەنگاوە سەرەتاییە ناتوانێ وڵامی ئاستی زانست و پێشکەوتنی ئەورۆکەی بوارەکانی تایبەت بە گژوگیا بداتەوە.

پاش ئەم هەنگاوە سەرەتاییە، وردەوردە تۆمار کردنی ژمارەی ڕووەکەکان ڕوویان لە زۆربوون کرد. زانایانی ڕووەکناس و زانستە سروشتیەکان بۆ پشکنینی سروشت و پێتاندنی ئەزموونەکانی خۆیان، بە گەشت و گەڕان ڕوویان لە دەشت و کوێستانە بەرزەکانی هەموو وڵاتانی دنیا کرد. بە جۆرێک کە یەکێ لە بەرنامە گرینگەکانی گەشتیاری ناسین و دیتنەوەی ڕووەکە تازەکان بوو تا تۆماری بکەن و ڕێژەی ناوی ڕووەکەکان زۆر بکەن. لە لایەکی دیکەوە داهێنانی ئامێری مایکرۆسکۆپ لە سەدەی حەڤدەی زاینیدا توانی پێشکەوتنێکی خێرا ببەخشێ بە بواری ڕووەکناسی گشتی و دۆزینەوەی تایبەتمەندیەکانی زاوزێ و بەشی ناوەکی گوڵەکان. چونکە ڕوونبوونەوەی ئەم بەشە، ڕووەکناسانی نزیکتر کردەوە بە پۆلێنبەندی پێشکەوتوو.

سالی ١٧٥٨ لینە (Carl Nilsson Linnaeus) قەشە و ڕووەکناسی سویدی دەرگای ڕووەکناسی نوێی ئاوەڵاتر کرد و سەرەتا ٦٢٠٠ و پاشان ٧٧٠٠ جۆر ڕووەکی لە کتێبەکەی (Systema Naturae) پۆلێنبەندی کرد. هەروەها لینە شێوازی ناونیانی دوانەیی (Binominal) داهێنا و کۆمەڵێک ڕێنمایی و ڕوونکردنەوەی لەم بارەوە لە پەرتووکێکدا بە ناوی (Species Plantarum) دەرخست. لە لایەکی دیکە ئەم ڕووەکناسە سەبارەت بە شرۆڤەی تایبەتمەندی و سیفاتی جۆرەکان شێوازێکی بەکارهێنا کە تاکوو ئێستاش لە لایەن ڕووەکناسانەوە بەکار دەبرێت. لینە بەهۆی ناونیانی دوانەیی خزمەتێکی شیاوی بە بواری ناونیان و پێناسەی زیندەوەران بەخشی. ئەم ڕووەکناسە ناوە دوور و درێژ و چەند وشەییەکانی ئەو سەردەمەی کرد بە دوو وشەی نەژاد و جۆر. بۆ نموونە جۆرێک ڕووەکی بزگیلە بە ناوی درێژی ( Physalis amno ramosissime ramis angulosis glabris foliis dentoserratis) کردی بە (*Physalis angulate* L.) واتا بزگیلەی ئانگۆلاتا. ئەم ڕووەکناسە لە سەر ژمارەی ئەندامی نێری (Stamen) گوڵەکان بیرۆکە و بنەمای خۆی بۆ پۆلێنبەندی دامەزراند. بەم پێیە ڕووەکەکانی بە ٢٤ دەستە دابەش کرد: وەکوو Monodria (گوڵێکە یەک ئەندامی نێری هەیە)، Diandria (گوڵێکە دوو ئەندامی نێری هەیە) و هتد.

ڕەوتی گەشەکردنی زانستی پۆلێنبەندی چەشنی هەموو زانستەکانی مرۆڤ ئاڵوگۆڕی زۆری بە سەردا هاتووە. بە شێوازێک پسپۆڕانی ئەم بوارە هەمیشە هەوڵیان داوە سەرەداوی جیاوازی سەرەکی نێوان جۆرەکان بدۆزنەوە و بە یارمەتی جیاوازیەکانی دەرەکی (وەکوو گوڵ، گەڵا، لاسک و ڕیشە) و ناوەکی (وەکوو بواری فیرۆژێنتیک)، ڕووەکەکان لە ئاستی خۆیاندا پۆلێنبەندی بکەن تا ناسین و توێژینەوە و بەکارئانینی بۆ مرۆڤ ئاسان بێتەوە. کەوابوو ئەم زانستە تاکوو ئێستا چەندین قۆناغی تێپەڕاندووە و بیرۆکەی تازە و داهێنانی نیشان داوە.

### پۆلێنبەندی کۆن (دەسکرد)

شێوازی ئەم پۆلێنبەندیە لە سەر جیاوازی یەک یان دوو دروشم (سیفەت) دامەزراوە. وەکوو پۆلێن کردن بەگوێرەی ژمارەی ئەندامەکانی نێر و مێ گوڵەکان، بیچمی گەڵاکان، تەمەنی ڕووەک یان وەرزی پشکوتنی گوڵ و هتد. بنیاتنەری ئەم پۆلێنبەندیە کارل لینە بوو. بەهۆی سانایی و ئاسانبوونیەوە سەردەمی لینە گەلێک پێشوازی لێ کرا. پاش ماوەیەک بە تێڕوانین لە جەماوەری زۆری گیاکان، پۆلێنبەندی ناوبراو کەوتە بەر ڕەخنە و پێشنیارەوە. ئەورۆکە پۆلێنبەندی کۆن تەنیا بۆ دانانی کلیلەکانی ڕووەکناسی و بۆ جیاکردنەوەی بەشێکی کەم لە فلۆری یەک ناوچە بەکار دەهێندرێ. ڕەخنەیەکی بەرز کە زانایان لەم پۆلێنبەندیە دەیگرن ئەوەیە: زۆر جار ئەو ڕووەکانەی کە لە یەک دەستەدا پۆلێن کراون کەمترین وێکچوونی ڕواڵەتی و پێوەندی بنەماڵەیان پێکەوە نییە. وەکوو هاودەستە بوونی داری بی و گیای شیرنۆکە لە دەستەی Diandria. ئەم دوو ڕووەکە زۆر جیاوازیان پێکەوە هەیە و لە دوو بنەماڵە و ڕیزی جیاوازیشدان.

### پۆلێنبەندی سروشتی

لەم پۆلێنبەندییەدا هەوڵ دراوە کە ئەو ڕووەکانە کە خاوەنی زۆرترین وێکچوونی دەرەکی و ناوەکین وەکوو ڕواڵەتی ڕووەک، پێکهاتەی کۆندامی گەشە، شێوازی جێگیربوونی گەڵا لە سەر لاسکەکان، پان و باریک بوونی گەڵا و هتد، بخرێنە یەک دەستەوە. وێکچوون و دروشمەکانی پۆلێنبەندی سروشتی زۆرتر وەکوو پێوەرێکی ناساندن و دەسنیشان کردنی ڕێژەی پێوەندی بنەماڵەیی ڕووەکەکان دادەنرێ. بنەمای سەرەکی ئەم پۆلێنبەندییە، جۆری ڕووەکە. بۆ دانانی یەک جۆر تەنیا جیاوازی یەک نیشانە و دروشم لە بەرچاو ناگیردرێ، بەڵکوو نیشانەکانی دیکەش بۆ ناساندنی جۆرێکی تایبەتی دەسنیشان دەکەن.

داهێنەرانی پۆلێنبەندی سروشتی، ڕووەکناسی فەڕانسەوی Dejussieu و سویدی Decandole بوون. هەر چەند ئەم پۆلێنبەندیەش هەمیشە ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. ئاخرین ئاڵوگۆڕ شێوازی ڕووەکناسان Hooker و Bentham کە تاکوو ئێستا نزیک بە ۷۰۰۰ نەژاد و ۹۷ هەزار جۆر ڕووەکیان پۆلێن کردووە. لە پۆلێنبەندی سروشتیدا دەستەی (Gymnosperms) کەوتۆتە نێوان گەڵاپان و گەڵاباریکەکانەوە، کە ئەمە ڕەخنەی سەرەکیە

لە سەر ئەم پۆلێنبەندیە. ئێستاکە پۆلێنبەندی سروشتی لە زۆربەی ڕێکخراوە و بنکەکانی ڕوەکناسی دنیادا بەکار دەبرێت.

بنچینەی بیرۆکەی ئەم پۆلێنبەندییە، بنەمایەکە لە ژێر ناوی نەگۆڕی جۆرەکان (Fixism). واتا بەرچاوترین نیشانە و سیفەت، سیفەتێکە کە ئەگەری نەگۆڕیی ١٠٠ و ئەگەری گۆڕانی سیفرە.

**پۆلێنبەندی تەکامولی (فیلۆژێنتیک)**

لامارک ڕوەکناسی فەڕانسەوی بیرۆکەی پۆلێنبەندی فیلۆژێنتیکی دەرخست. پاشان لە سەر ئەم ڕێچکەیە، بەهۆی توێژینەوەکانی داروین و هەروەها پشکنین و دەرنجامی کەلەخەبەردەکانی گیایی (Paleobotanic)، ڕوەکناسان بۆیان دەرکەوت: دێرینەی ڕوەکەکان نیشانی دەدەن جۆرەکانی ڕوەک بەپێی دیاردەی تەکامول و گووران بەدی هاتوون. واتا ڕوەکەکان ڕەگەزنامەی (شەجەرەنامە) خۆیان هەیە و هەر (Phyllum)ی ڕوەک چلێک لەم ڕەگەزنامەیە ئەژمار دەکرێت. بیرۆکەی ئەم پۆلێنبەندییە لە سەر بنەمای گۆڕان و گوورانی جۆرەکانە لە درێژایی مێژوودا، کە ئاوڕی لە هەمان بیرۆکەی داروین داوەتەوە.

شێوازی (Engle - Prantle): لەم شێوازەدا سەرەڕای قبوولْ کردنی تایبەتمەندیەکانی پۆلێنبەندی سروشتی، بنەما و قۆناغەکانی گووران و تەکامولی ڕوەکەکانیش پاشکۆ کراوە و یەکەمین دەسپێکە لە پۆلێنبەندی تەکامولیدا. لە شێوازی ناوبراو ڕوەکەکانی (Angiosperms) بوون بە دوو بەشی گەڵاپان و گەڵاباریک. کەوابوو جیاواز لە پۆلێنبەندی سروشتی، ڕوەکەکان دەبن بە سێ بەشی (Gymnosperms) و گەڵاپان و گەڵاباریکەوە.

شێوازی (Bessey) یان بیرۆکەی ڕانالی: بە شوێن شێوازی (Engle - Prantle) کە پەسەندی زۆربەی ڕوەکناسان بوو، Bessey بنەماڵەی (Ranunculaceae) بە سەرچاوەی سەرهەڵدانی سەرجەم (Angiosperms) دانا. پۆلێنبەندی Bessey دەریخست کە بنەماڵەی (Ranunculaceae) لە سێ ڕێبازی جیاوازدا ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هاتووە. ڕێبازێک بۆ گەڵاباریکەکان و دوو ڕێبازی دیکە سەرجەم گەڵاپانەکانی لێ جیا بووەتەوە.

شێوازی (Hutchinson) یان بیرۆکەی ماگنۆلیایی: Hutchinson لەم شێوازەدا سەرجەم ڕوەکەکانی بە دوو دەستەی ئالیکی (Herbraize) و چێوی (Lignosae) دابەش کرد. بە بۆچوونی ئەم ڕوەکناسە ڕوەکە ئالیکیەکان لە گۆڕانی بنەماڵەی (Ranunculaceae) و ڕوەکە داری و چێویەکانیش لە بنەماڵەی (Magnoliaceae) سەرچاوەیان گرتووە. شێوازی ناوبراو لە چاوەی شێوازەکانی دیکە کەمتر پێشوازی زانستی لێ دەکرێ.

بەگشتی لە سەر سیستەمی دوو ناوی لینە و هەروەها پۆلێنبەندی سروشتی، ئەورۆکە ئیدی بنەمای سەرەکی بۆ پێناسە کردنی هەموو جۆرەکانی ڕوەک هەمان ناوی زانستیە. کەوابوو لە زانستی بایۆلۆژیدا بۆ هەموو زیندەوەرانی ڕوەک و ناڕوەک دەتوانین لە ئاستی زنجیرەوە هەتا

جـۆر و بنجـۆر و هتـد بـرۆین، بـەم شـێوەیـە: زنجـیرە (Kindom)، لـق (Division)، پـۆل (Class)، ڕیز (Order)، بنەماڵە (Family)، نەژاد (Genus)، جۆر (Species)

**زنجیرەی ڕووەک بە ٤ لق دابەش دەبێت:**

- لقـی (Tallophytes) وەکـوو قـەوزە، کـرێژەبـەرد و کـوارگ: ئـەندامـەکـانی ڕیشـە و پەلک و لاسکی گووراو و تەکامولیان نییە بەڵکوو تەنیا پێکهاتوون لە چـەندین ڕیز خانە (سێلوول)
- لقی (Bryophytes) وەکوو کـەفس (Mosses) و (Hepatic): ئـەندامی لاسـک و پەلکیان هەیە بەڵام ڕیشەیان نەگووراوە
- لقـی (Petridophytes) وەکـوو گیـا پـەلـەکـەرگ و فیـزۆک و Lycopodineae: ئەندامەکانی ڕیشە و پەلک و لاسکیان هەیە بەڵام ئەندامی گوڵ لەماندا نەگووراوە
- لقـــی (Spermatophytes) وەکـــوو ســـەرجـــەم (Gymnospermes) و (Angiospermes): هەموو ئەندامەکانی گوڵ، پەلک، لاسک و ڕیشـە بـە شـێوەی گووراو لەم لقەدا دەبینرێت. زۆربەی ڕووەکەکان لە ئاستی ئەم لقەدا پۆلێن کراون
- دەسـتەی (Gymnospermes) وەکـوو بنـەماڵـەکـانی کـاژ (Pinaceae)، ئـەسـروو (Cupressaceae) و (Taxacaeae)
- لقـی (Angiospermes) دەبـن بـە ٢ پـۆلی گـەڵـاباریک (Monocotyledon) و گەڵاپان (Dicotyledon)
- پۆلی گەڵاباریکەکان (Monocotyledon) وەکوو بنەماڵەکانی پیـواز (Liliaceae)، گەنم (Poaceae)، خورما (Palmaceae)، زافەران (Iridaceae)
- پۆلی گەڵاپانەکان (Dicotyledon) دەبن بە ٣ ڕیزی بێگوڵـپەڕەکـان (Apetales)، جودا گوڵپەڕەکان (Dialypetales) و گوڵپەڕە یەکپارچەکان (Gamopetales)
- ڕیزی بێگوڵپەڕەکان (Apetales) وەکوو بنەماڵەکانی فنەق (Corylaceae)، گـوێز (Juglandaceae)، وزم (Ulmaceae)، دارتـــــوو (Moraceae)، ســـــپیناخ (Chenopodiaceae)، ترشۆکە (Polygonaceae)
- ڕیزی جودا گوڵپەڕەکان (Dialypetales) وەکوو چنارەکەڵـە (Ranunculaceae)، وەنەوشە (Violaceae)، هێرۆ (Malvaceae)، زرێشـک (Berberidaceae)، گـەز (Tamaricaeae)، نـــۆک (Fabaceae)، سمـــاق (Anacardiaceae)، تـــرێ (Vitaceae)، بەڕەزا (Apiaceae)
- ڕیزی گوڵپەڕە یەکپارچەکان (Gamopetales) وەکوو زەیتوون (Oleaceae)، ژاڵـە (Apocynaceae)، گۆزروان (Boraginaceae)، سێف زەمینـی (Solanaceae)، کوولەکە (Cucurbitaceae)، پوونگە (Lamiaceae)، چەقچەقە (Asteraceae)

- بنەماڵە دەتوانێت خاوەنی یەک تا چەندین نەژاد (Genus) بێت وەکوو بنەماڵەی (Rosaceae): نەژادەکانی گوڵباخی (Rosa)، هەرمێ (Pyrus)، بەهێڤ (Amygdalus)، هەڵووچە (Prunus)، سێو (Malus)، تووودڕک (Rubus)، توفەرەنگی (Fragaria)، گوێژەمازەنی (Mespilus)، گوێژ (Crataegus)، براڵووک (Cerasus)، بەهێ (Cydonia)
- نەژاد دەتوانێت خاوەنی یەک تا چەندین جۆر (Species) بێت وەکوو نەژادی بەهێڤ (Amygdalus): دار بەهێڤ (*A. communis*)، تەنگس (*A. lycioides*)، بایەمە شینکە (*A. haussknechtii*)، بەهێڤە ڕەواندزی (*A. carduchorum*)، هەرجن (*A. wendelboi*)، بایەمە کێوی (*A. scoparia*)
- جۆرەکانیش دەتوانن خاوەنی یەک تا چەندین ژێرجۆر، وارێتە، فۆرم و کولتیوار (ڕەقەم) بن. هەرکام لە ئاستەکانی خوارتر لە جۆر دەتوانن بەهۆی نیشانە و سیفەت و تایبەتمەندییەکەوە دەربکەون.

کولتیوار لە کشتوکاڵدا بەکار دەبرێت و بەپێی شوێنی جوغرافیایی، کەش‌وهەوا، خاک و ئاو هەڵوێستی جۆراجۆری بۆ بەرهەم هەیە. کولتیوارەکان دەتوانن لە هەر ناوچە و وڵاتێکدا جیاواز بن و هەر ساڵە توێژەران ڕەقەمی تازە پێشکەش دەکەن، وەکوو چەند نموونە لە ڕەقەمەکانی گەنم (*Triticum aestivum* L.) لە ئێران (بێستوون، ئازەر، خەزەر، زەڕین، سەرداری، چورەک، کاوە، نەوید، ئەڵوەند و ئازادی). هەرکام لە ڕەقەمەکانی ناوبراو بۆ بەدەست هێنانی ئاستی بەرهەمی شیاو تایبەت بە ناوچە، کەش‌وهەوا، خۆڕاگری بە سەرما یان گەرما، بەرزی لاسک، خۆڕاگری بە زۆری یان کەمی ئاو و هتد، تەرخان کراوە.

ئاستی وارێتە تەنیا لە یەک یان چەند سیفەت و دروشمی بچووک و کەم‌بەها بەڵام دیار و بەرچاو بەرامبەر جۆری سەرەکی جیاوازی هەیە. بۆ نموونە گوڵپەڕەکانی وەنەوشەی بۆنخۆش (*Viola odorata* L.) ڕەنگیان بەنەوشە بەڵام لە وارێتەدا ڕەنگی سپی گرتووە یان وارێتەی بایەمی شیرین (*Amygdalus communis* L. var *dulcis*) و بایەمی تاڵ (*A. communis* L. var *amara* (DC.) focke.) و بایەمی گەڵوازە (*A. communis* L. var *fragilis* (Bovkh.) focke.). بایەمی شیرین و گەڵوازە ناوکەیان شیرینە و هەروەها پێشەی بایەمی شیرین و تاڵ ڕەقە و بایەمی گە-ڵوازە ناسکە. جیاوازییەکانی دروشم و نیشانەکانی وارێتە بەرامبەر جۆری سەرەکی دە-توانن لە بیچمی گەڵاکان، بوون و نەبوونی کولک، دڕکدار و بێ‌دڕک، ڕەنگی گوڵپەڕە، شیرین و تاڵ بوونی ناوکە، ناسک و ڕەق بوونی پێشەی ناوکە و هتد جیاواز بێت. سە-رهەڵدان و دروستبوونی وارێتەی تازە بەهۆی دیاردەکانی موتاسیۆن (وەرسووڕانی ژێنێتیکی) و هیبریداسیۆن (دووڕەگەگیری) بەدی دێت.

ژێرجۆر یەکێ لە پۆلێنەکانی ڕووەکناسیە کە وێکچوونی زۆرە لەگەڵ جۆری سەرەکی، بەڵام بەهۆی دیاردەی تەکامول و گووران، ژێرجۆرەکان لە DNA ناو خانەکانیان لێک جیاوازن. ڕووەکناسان باس لەوە دەکەن کە دووری لە یەکتر و کات و شوێنی ڕسکانی ژێرجۆرەکان، جۆری سەرەکی و ژێرجۆرەکان لێک جیا دەکاتەوە. بۆ نموونە جیاوازی نێوان دوو ژێرجۆری خاشە لە جۆری (*Onobrychis aucheri*Boiss.) لە ڕێژەی کرۆمۆزۆمەکاندا دەرکەوتووە. ژێرجۆری خاشەی بیاوانی خیزەڵانی ( *O. aucherri*Boiss. subsp. *Psammophila*(Bornm.) Rech. F.) تێتراپلۆییدە و ٣٢ کرۆمۆزۆمی هەیە بەڵام ژێرجۆری خاشەی بیاوانی تارانی ( *O. aucherri*Boiss. subsp. *teheranica*(Bornm.) Rech. F.) دیپلۆییدە و خاوەنی ١٦ کرۆمۆزۆمە.

**ڕێنماییەکانی ناوی زانستی**

١- ناوی زانستی ڕووەکەکان، بەپێی پەسەندنامە و پێڕەوەکانی بنکەی ناونیانی ناودەوڵەتی ڕووەکناسی (IPNI: International Plant Names Index) و ڕەچاوَ کردنی بنەماکانی کۆدی نێونەتەوەیی ناوی ڕووەکەکانە ( NICB: Nomencalture International Code of Botanical). ناوی زانستی دانراو لە لایەن (NICB) هەمان ناوێکە کە لە تەواوی دنیا، جۆری ئەو ڕووەکەی پێ دەناسن. ڕێچکەی سەرەکی هەمان یاسای ناوی دوانەیی (Binomial) لینەیە.

٢- زوانی فەرمی بۆ دانانی ناوی زانستی هەمان زوانی لاتینە، کە هەندێ جار بە ناوی لاتینیش دەیناسن. ئەم ناوە پێکهاتووە لە: سەرەتا نەژاد پاشان جۆر (سیفەتی تایبەتی نەژاد). وشەی دانراو بۆ نەژاد و جۆر (بێجگە لە هەندێ ئاوارتە) هەمیشە یەک وشەییە. لە دۆخی ئاوارتەدا شێوازی نووسینی ناوی زانستی بەم شێوە دەبێت:
*Ziziphus spina-christii* (L.) Wild.

٣- پیتی (.L) کە پاش ناوی جۆر بە پێنووسی ئاسایی دێت هەمان کورتکراوی ناوی لینەیە کە سەرەتا لینە ئەو ناوەی داناوە. هەر چەند دواتر بۆ جۆرەکانی تازە ڕووەکناسێک یان چەند ڕووەکناس پێکەوە ناوێکی زانستیان داناوە، کورتکراوی ناوی ئەوانیش پاش جۆر هاوپێچ کراوە.

٤- زۆربەی ناوە زانستیەکان وەرگیراوە لە زوانی لاتینی کە دەکرێت دروشم و سیفەتێکی بەرچاوی ئەو جۆرە ڕووەکە بێت، بۆ نموونە:

- بەکارهێنانی جۆر چەشنی گیای دەرمانی بە (officinalis)
- بەهۆی پێکهاتەی دەرمانی یان کیمیاوی تایبەتی ناو جۆر بە (mannifera)
- ڕەنگی تایبەتی گوڵ یان ئەندامێکی‌تری گیا بە (alba) بۆ سپی و (nigra) بۆ ڕەش
- سەرچاوەی سەرەکی ڕسکانی جۆر بە (arvensis) بۆ دەشت و (montana) کوێستانی

- ناوی گشتی بۆ جۆر بە (vulgaris) یانێ ئاسایی
- شوێنگەی سەرەکی ڕسکانی جۆر بە (kurdistanica)
- شوێنی یەکەم جاری کۆکردنەوەی جۆر بە (elymaitica) یانێ ئیلامی
- شێوازی ڕسکانی جۆر بە (sativum, sativus, sativa) واتا جۆری کشتوکاڵی
- نیشانە و دروشمێک لە جۆر بە (monophyllum) واتا یەک پەل
- ئەندازەی تایبەتی جۆر بە (minus) بۆ بچووک و (major) بۆ گەورە

٥- لە زوانی لاتیندا سیفەت بە نێر، مێ و بێلایەن دەسنیشان دەکرێت. بۆیە لە کۆتایی جۆر بە (us) بۆ نێر، (a) بۆ مێ و (um) بێلایەن دەرئەکەوێت. وەکوو *Arum acolantum*، *Medicago sativa* و *Carthamus tinctorius*

٦- ناوی زانستی بە شێوەی ئیتالیک دەنووسرێت، هەروەها لە دەقی دەسنووسدا پێویستە هێڵێک بکێشرێتە بنیدا.

٧- کاتێک لە دەقێکدا پێویستە چەندین جار ناوی زانستی ڕوەکێ بهێندرێت، دەکرێ یەکەم جار ناوی دوانی تەواو بنووسرێت. ئیدی لە جارەکانی دیکە پیتی یەکەمی نەژاد بە شێوازی گەورە و لە پەنای یەک خاڵدا بهێندرێت (*A. macolamtum*)

٨- کاتێ بۆ ناوی زانستی مەبەست جۆرێکی نەدیار و نەناسراو لە یەک نەژاد بوو، ئەوە پاش نەژاد (sp.) بەڵام نەک ئیتالیک، دەنووسرێتەوە. وەکوو *Poa* sp.

٩- ئەگەر لە ناوی زانستیدا مەبەست لە چەند جۆری یەک نەژاد بوو، ئەوە (spp.) بێ ئیتالیک دەنووسرێت. وەکوو *Cousinis* spp.

١٠- هەر یەکەی جۆری ڕوەک تەنیا یەک ناوی زانستی بۆ پەسەند دەکرێت و نابێ ناوێکی زانستی بۆ دوو جۆر ڕوەک دابنرێت.

١١- لە ناو نەژادەکانی یەک بنەماڵەدا پاشگری (aceae) دەخرێتە پاڵ نەژادێکی ناسراوی ئەو بنەماڵە و چەشنی ناوی بنەماڵە دەناسێنرێت، وەکوو لە بنەماڵەی وەنەوشەدا پاشگری (aceae) دەکەوێتە پاش (viola) ـکە نەژادی بەناوبانگ و زۆرینەی ئەم بنەماڵەیەـ و دەبێت بە بنەماڵەی (Violaceae). لە کوردیشدا بۆ ناوهێنانی بنەماڵە هەر بەم شێوازەیە بەڵام پاشگری (یەکان) دەگرێت، وەکوو: وەنەوشەییەکان، پوونگە-ییەکان، پیوازیەکان، پرتەقاڵیەکان، کەرەوزیەکان، کەلەرمیەکان، چیمەنیەکان و هتد. هەندێ لە بنەماڵەکان پێش ئەم یاسایە ناوی بنەماڵەیان بۆ دانراوە وەکوو (Composite: Asteraceae, Umbelliferae: Apiaceae, Cruciferae: Brasicaceae, Gramineae: Poaceae, Labiatae: Lamiaceae,)

١٢- کاتێک جۆرێکی ڕوەک سەرەتا لە بازنەی نەژادێکدا جێ گرتبێت، بەڵام دواتر بەهۆی ڕوەکناسێکی دیکەوە ببرێتە ناو نەژادێکی‌تر، پێویستە ناوی ئەو ڕوەکناسە کە

سەرەتا ئەو جۆرەی داناوە لە کەوانەدا پاش جۆر بهێندرێت و بە شوێنیدا ناوی ڕوەکناسی دووهەم تۆمار بکرێت، وەکوو *Torilis nodosa* (L.) Gaertn.

١٣-کاتێ بۆ یەکەم جار جۆرێکی ڕوەک ناو دەنرێت، پێویستە ئەو ڕوەکناسە کە جۆرەکەی کۆ کردۆتەوە نموونەیەکی تەواو و تۆکمە بنێرێت بۆ یەکێ لە ڕێکخراوەی (IPNI) هەتا لەوێ پارێزگاری بکرێت و ناوەکەی تۆمار بکات. ئەم نموونەیە بە Type یا Holotype ناوی لێ دەبەن. ئەگەر ڕوەکناس لەبری یەک نموونە، چەندین نموونە بنێرێت یەکێک لەوانە Holotype و ئەوانی دیکەش بە Paratype دەناسرێن. هەروەها ئەگەر ڕوەکناس سەرەڕای Holotype، نموونەی دیکە لەو ڕوەکە ناسراوە بنێرێت بۆ ڕێکخراوەکانی دیکە، ئەوە ئەو نموونە نێردراوانە بە Isotype ناودێر دەکرێت. جاری وایە ڕوەکناس Holotype دیاری ناکات بەڵکوو Holotype لە لایەن ڕوەکناسانی دیکەوە بژاردە دەکرێت، لێرەدا نموونە بە Lectotype دەناسرێت.

ئەم پەرتووکە (فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستان) ڕێچکەی یاساکانی (IPNI) و (ICNB) ڕەچاو کردووە، واتا:

١- ناوی زانستی یان لاتینی جۆرەکان بەپێی نوێترین ناوی پەسەندکراو دانراوە

٢- دانانی سەرناوی جۆر لە ناوی زانستیەکە کە پێناسەیەکی کوردەواریە (بەهێقی ورمێیی: *Amygdalus urumiensis* چنارەکەڵەی ئیلامی: *Ranunculus elymaticus*، خاشەی شاهۆیی: *Onobrychis schahuensis*، مێوەخۆرکەی کوردی: *Cuscuta kurdica*)

٣- تایبەتمەندی ڕواوگەی تیپی ڕوەک کە یەکەم جار لەو شوێنگە تایبەتیە کۆ کراوەتەوە (بۆزانەی زاگرۆسی: *Achilleafilipendula* بەهێقی ڕەواندزی: *Amygdaluscarduchorum* گوڵە گوارەی مەریوانی: *Onosmarechingeri*، ئەسپۆنی هەولێری: *Gypsophila boissierni*)

٤- وەرگێڕانی لاتینی ناوی جۆر (ئەسپەکی ڕاست: *Bromus erectus* ئەولیاگەونی پەلکدار: *Acantholimon bracteatum* کەتانی سپی: *Linum album*)

٥- ڕوەکناسان ناوی زانستی هێندێ لە ڕوەکەکانیان لە سەرەتای تۆمار کردنی ناویانەوە تاکوو ئێستا یەک یان چەند جار گۆڕیوە کە لێرە دوایین و نوێترین ناو سەرەتا نووسراوە پاشان هاوناوەکانی دیکەیش هاتووە، چونکە ناوی تازە ناوێکی پەسەند و درووسترە لە بنکەکانی ڕوەکناسی و ناوەندە زانستیەکاندا (*Verbascum nudicaule* (Wydi.) Takht. = *V. persicum* (C. A. Mey.) O. Kuntze. = *Celsia nudicaule* (Wydi.) B. Fedtsch. = *Celsia persica* C. A. Mey. = *Scrophularia nudicaule* Wydl.).

* * *

## باخی ڕوەکناسی

ڕووبەرێکی بەرفراوان و تەرخانکراو کە بەشێوەی دەسکرد جۆرەکانی ڕوەکی تێدا دەچێنن و پەروەردەی دەکەن. ڕێکخراوەی جیهانی یۆنێسکۆ ژمارەی باخە ڕوەکناسیەکانی دنیای تاکوو ئێستا نزیک بە ۲۰۰۰ دانە تۆمار کردووە. ٤٧٠ ساڵ پێش، ئیتالیاییەکان باخەکانی ڕوەکناسی "پیزا و پادوا"یان لە وڵاتەکەیان بنیات نا یان لە وڵاتی ئێران ساڵی ۱۳٤٧ بناغەی باخی ڕوەکناسی نەتەوەیی لە ناوچەی چیتگەر لە سەر ڕێگەی تاران بۆ کەرج لە زەوینێکی ۱٤٥ هێکتاری دەست پێکرا. باخی کیوو (Royal Botanic Garden Kew) یەکێ لە تۆکمەترین و دەوڵەمەندترینی باخەکانی ڕوەکناسی دنیا. ساڵی ۱۷٥۹ لە لایەن کۆمەڵێک ڕوەکناس لە شاری لەندەن لە زەمینێکی ۱٥ هێکتاری دەست بە دروستکردنی کرا. ئێستاکە ڕووبەری گشتی باخی کیوو بە ۱۲۱ هێکتار گەیشتووە و ۲۲۰ ڕوەکناسی پسپۆڕ و ٥۰۰ کارمەندی دیکە وەکوو فیلمساز، مامۆستای زانکۆ، خوێندکاری ناوخۆ و بیانی، ژمێریار و بەرپرسی‌تر لەم باخە سەرقاڵی کار و توێژینەوەن. ئەم باخە تاکوو ئێستا توانیویە ساڵانە نزیک بە ٤۰۰۰ جۆر ڕوەک لە سەرانسەر دنیا -کە خەریکە لە ناو دەچێ یان لە ناو چووە- دیسانەوە زیندوو بکاتەوە و بەخێویان بکات. هێرباریۆمی کیوو باتر لە ۷ ملیۆن نموونەی وشک‌کراوی جۆرەکانی ڕوەکی بە شێوازێکی زانستی هەڵگرتووە و چەشنی مۆزەخانەیەکی گەورەی ڕوەکناسی ڕۆژانە هەزاران گەشتیار و توێژەر سەردانی دەکەن. ئەم هێرباریۆمە ڕەنگە بۆ هەر یەک جۆر ڕوەک لە سەرانسەری دنیا چەندین نموونەی هەڵگرتبێت. هەروەها کیوو شوێنگەیکە کە باتر لە ۳۰۰۰۰ جۆر ڕوەکی دنیای تێدا چاندراوە و پەروەردە دەکرێت. ڕێکخراوەی (IPNI) -کە ئەرکی ناونیانی زانستی جۆرەکانی ڕوەکی لە ئەستۆدایە- لە ئەنجامی یارمەتی و هاریکاری هاوئاهەنگ لە نێوان بنکەی ڕوەکناسی باخی کیوو لە لەندەن، هێرباریۆمی زانکۆی هاروارد لە ئەمریکا و هێرباریۆمی سروشتی ئوسترالیا پێکهاتووە.

باخی ڕوەکناسی دەتوانێت ڕوەکستانێکی سروشتی بێت بۆ چاندن، ناساندن، توێژینەوە و نیشاندانی سەرجەم جۆرەکانی ڕوەک کە تایبەت بە گشت جیهانە یان سنوورێکی دیاریکراو. هەروەها شوێنێکە بۆ کۆکردنەوەی بانکی ژێنێتیکی جۆرەکانی دنیا یان چاندنی ئەو ڕوەکانە کە لە دنیا خەریکە لە ناو دەچێت یان دەمێکە تووی بڕاوەتەوە. بەگشتی دەتوانین ئامانجەکانی باخی ڕوەکناسی بەم شێوەیە ڕیز بکەین: کۆکردنەوە، ناساندن، چاندن، توێژینەوە، ناونیان، بانکی زانیاری سروشتی، بانکی ژێنێتیک، هەڵگرتنی جۆرەکانی تایبەتی و سەرنج‌ڕاکێش، ڕزگار کردنی ڕوەکە دەگمەن و لە ناوچووەکان، هەڵگرتن و زیاد کردنی تووی جۆرەکان، مۆزەخانەی سروشتی و ڕوەکستان (هێرباریۆم)، پێشانگای هەمیشەیی ڕوەک و سروشت، نیشاندانی بارودۆخ و کەشی سروشتی و ڕوەکناسی هەموو ناوچەکان لە یەک شوێندا و هەروەها ئاشنا کردنەوەی مرۆڤ لەگەڵ زنجیرەی ڕوەکەکانی سروشتی جیهان.

باخی ڕوەکناسی نەتەوەیی ئێران ـکە خاوەنی چەندین لقی دیکەیە لە ناوچەکانی دیکەی ئێران ـ بانتر لە ٤٠٠٠ جۆر ڕوەکی تێدایە. ڕێژەیەکی بەرچاو لە ڕوەکەکانی فلۆری کوردستان لە بەشی ناوچەی ئازربایجان، قەفقاز، خووزستان و زاگرۆس لەم باخەدا دەبینرێن. باخی ناوبراو دابەش کراوە بە ناوچەکانی جوغرافیایی زاگرۆس، ئەلبورز، خەزەر، ئێران و توورانی، باخی پیازی، باخی میوەی ئێرانی، گەڵاپانە هەمیشەسەوزەکان، گوڵخانەی ڕوەکەکانی نیوەگەرمیانی و هەروەها شوێنگەی ڕوەکەکانی ئورووپا، ئەمریکا، قەفقاز، هیمالیا، چین و ژاپۆن. هەروەها لقەکانی لاوەکی لە شارەکانی دیکە بریتین لە: باخی نەوشەهری مازندەران (ڕوەکی ناوچەکانی ئورووپا)، تەوریز (ڕوەکی ناوچەکانی ڕۆژاوای ئێران کە کوردستانیش دەگرێتەوە و بە باخی ئێرانی و توورانی و هیرکانی دەناسرێ)، فەدەک لە خووزستان (ڕوەکی ناوچەکانی گەرمێن و وشکەکان)، کاشان و یەزد (ڕوەکی ناوچەکانی گەرم و بیاوانی)، مەشهەد (ڕوەکەکانی ئێرانی و توورانی) و هەمەدان (ڕوەکە دەرمانیەکان). هەروەها دەستەی پسپۆڕان و ڕوەکناسانی باخی ڕوەکناسی ئێران چەندین ساڵە گۆڤاری ڕوەکناسی ئێران بە زوانی ئینگلیزی چاپ دەکەن و دەرنجامە تازەکان وەکوو دیتنەوەی جۆرەکانی تازەی ڕوەک لە سنووری ئێران و گۆڕانی ئاستەکانی پۆلێنبەندی ڕوەکناسی تێدا تۆمار و بڵاو دەبێتەوە. ئەم گۆڤارە گەلێک جۆری ڕوەکی تازە کە لە کوردستاندا بینراوەتەوە تێیدا چاپ کراوە.

ئەوڕۆکە وڵاتانی پێشکەوتوو دەستیان داوەتە بنیادنانی باخە تایبەتیەکان وەکوو باخی ڕوەکناسی گوڵباخی و گوڵە داویتیەکان. لەم باخانەدا سەرجەم جۆر و ژێرجۆر و فۆرم و شێوەجۆرەکانی یەک جۆر ڕوەک بە هەموو جیاوازیەکانی ڕەنگ، بۆ، ئەندازە، جوانی و ژینێتیک لە تەواوی دنیا لە یەک شوێندا کۆ دەکەنەوە و گەلێک سوودی فرۆش، توێژینەوە، زانیاری و گەشتیاری لێ بە دەست دێنن.

### فلۆری کوردستان

فلۆر (Flora) دوو واتای لێ دەبێتەوە: یەکەم بە مانای سەرجەم جۆرەکانی گژوگیای ناوچەیێکی جوغرافیایی یان سیاسی، دووهەم بریتیە لە پەرتووکی ڕوەکناسی کە تێیدا سەرجەم ڕوەکەکانی یەک ناوچە یا وڵاتێکی پێناسە کردووە. زۆر جار فلۆری تایبەت بە وڵات یان نیشتمانی یەک نەتەوە دەتوانێت چەشنی نیشانە و دروشمێکی چەسپاو بێت لە سەر ناسنامەی نەتەوەیی. تەنانەت وڵاتان کاتێ فلۆری نیشتمانیان ئامادە دەبێ بۆ نیشاندان و بانگەشەی پێناسەی سروشتەکەیان ئاهەنگێکی بەرفراوانی بۆ دەگرن و دنیای پێ ئاگەدار دەکەنەوە. پاڵپشتی سەرەکی فلۆر، هێرباریۆمی گیاکانە. هێرباریۆم بنکەیەکی دیاریکراوە کە ڕوەکەکانی کۆکراوە، ئامادەکراو و ناودێرکراوی یەک یان چەندین ناوچە یاخود وڵاتێک، بە شێوازێکی تۆکمە و ڕێکوپێک هەڵدەگرێت و پارێزگاریان لێو دەکات و کاتی زۆر پێویست ڕوەکناسانی سەرەکی یان خوێندکارانی تایبەت سەردانی دەکەن.

ناوچەکانی کوردەواری کەوتوتە ناو سنووری وڵاتانی ئێران، عێراق، تورکیە، سووریە و ئەرمەنستان. بە حوکمی ئەوە کە نیشتمانی کوردستان خاوەنی گەلێک زنجیرە چیا و دەشتی بەرین و بەپیتە، چاوەڕێ دەکرێت جەماوەرێکی زۆر جۆری ڕوەکی تێدا بەرچاو بکەوێت. شاخاوی بوونی کوردستان لە لایەک و هەروەها ناتەناهی بوونی هەندێک لە ناوچەکانی وایکردووە ڕوەکناسان بەتەواوی نەتوانن فلۆری ئەم بەشە لە دنیا پێناسە بکەن. بۆ نموونە زنجیرە چیای قەندیل لە نێوان سێ سنووری ئێران و عێراق و تورکیە -کە بەردەوام شوێنگەیەکی ناتەناهی بووە- تاکوو ئێستا پێناسەی تەواوی جەماوەری ڕوەکی بۆ نەکراوە. کاتێک گەرەکمان بێت فلۆری جوغرافیای کوردستان کۆ بکەینەوە پێویستە فلۆری ئەو وڵاتانەی -کە بەشێکی کوردستانیان تێدایە- بەتەواوی و وردی بپشکنین و بەشی کوردستانیان لێ جیا بکەینەوە و فلۆری تایبەتی کوردستان بنووسین. بۆ ئەم پەرتووکە، سەرەتا ئامانجم دانانی فلۆری کوردستان بوو. بۆیە هەولی زۆرم خستە گەڕ هەتا فلۆری وڵاتانی ناوبراو بەدەست بێنم بەڵام تەنیا فلۆری ئێرانم دەست کەوت. ئەڵبەت کاتی تەرخانکراو و باری ماڵیش کاریگەر بوو. ئیدی پشت بە خوا لە خشتەی بەرنامەی داهاتووم داناوە کە فلۆری ئەو وڵاتانەش بەدەست بهێنم و بەشی کوردەواریان لێ هەڵبژێرم و فلۆری کوردستان ئاراستەی کتێبخانەی کوردی بکەم.

سەردەمی ڕوەکناسی نوێ (زانستی) و دانانی بەرنامەی فلۆری وڵاتان بۆ پاش ڕۆنێسانسی ئەورووپا دەگەڕێتەوە. واتا ئورووپاییەکان ٣٢٠ ساڵ لەمەو پێش دەستیان دایە ناسینەوە و کۆکردنەوەی گژوگیای وڵاتەکانیان و فلۆری خۆیان پێش هەموان ئامادە کرد. ئەو کاتەی ئیدی فلۆرەکانیان لە سووچ و سەرای زانکۆ و قوتابخانەکان دانا و کردیان بە سەرکاروانی سەرچاوەی فلۆری دنیا، هەستان و هاتن بەرەو وڵاتانی دیکە وەکوو ڕۆژهەلاتی دنیا. دەسکەوتی هەر گەشتێکی کورت و درێژی ئەم ڕوەکناسانە، دەیان و سەدان جۆری ڕوەکی بێ ناونیشان بوو. بە ویستی خۆیان سەرناوی زانستییان لە سەر دادەنا و بە کۆمەڵ و ڕێکخراوەی ڕوەکناسی دنیایان دەناساند. ئەگەر چاوێک بە پێرستی ناوی زانستی ڕوەکەکانی خۆماندا بخشێنین، دەبینین زۆربەیان بە ناو و نازناوی ڕوەکناس، نیشتمان و باوڕ و فەرهەنگی دەرەکی ناودێر کراون: نەژادی ڕوەکی Abelia وەرگیراو لە ناوی فیزیکزانی چینی Dr. ClarkeAbel، نەژادی Allium ناوی زوانی لاتینیە بۆ گیای سیر، Amygdalusناوێکی یۆنانیە، Begoniaناوی ڕوەکناسی کەنەدی MichelBegon و هتد.

یەکەم جار ساڵی ١٦٨٥ زایینی ئورووپاییەکان کاری ناسینەوە و کۆکردنەوەی جۆرەکانی گژوگیای سروشتی ئێرانیان دەست پێکرد. ساڵی ١٩٣٧ دکتور ئەحمەدی پارسا کاری فلۆری ئێرانی لە ژێر ناوی (Flora de L'Iran) بە فەڕانسەوی و لاتینی نووسی. هەروەها ڕوەکناسی توانا (Rechinger) ساڵی ١٩٦٣ دەستی کرد بە نووسینی فلۆری ئێران لە ژێر ناوی (Flora Iranica) بە زوانی ئینگلیزی و لاتین. تایبەتمەندیەکانی فلۆری ڕشینگێر ئەوە بوو زۆربەی ڕوەکەکانی سنووری ئێران، باکووری عێراق (باشووری کوردستان)،

ئەفغانستان و ڕۆژاوای پاکستانیشی لە خۆدا کۆ کردبۆوە. ساڵی ١٣٥٤ هەتاوی دکتۆر قەهرەمان دەستی کرد بە نووسین و ئامادە کردنی فلۆری ڕەنگی ئێران لە ٨٠ بەرگدا. ئەم فلۆرە تاکوو ئێستا ٢٥ بەرگی چاپ کراوە. بەگشتی ئەورۆکە بەهۆی بنکەی توێژینەوەکانی ڕووەکناسی پارێزگاکان، زۆربەی ناوچە و پارێزگاکانی ئێران فلۆری تایبەتی خۆیان هەیە. بۆ نموونە فلۆری ئیلام (دانەری دوکتۆر موزەفەریان)، کوردستان (دانەری ئەندازیار حوسێن مەعرووفی)، کرماشان (ناوەندی توێژینەوەی کشتوکاڵی و ژینگەی پارێزگای کرماشان) و ورمێ (ناوەندی توێژینەوەی کشتوکاڵی و ژینگەی ورمێ). یەکێ لەو فلۆرانە کە بە تێزی و تۆکمە کاری لە سەر کراوە و دەکرێت چەشنی بنەمای فلۆری گشت کوردستان کاری لە سەر بکرێت، فلۆری پارێزگای کوردستانە کە ئێستا ئامادەی چاپە و بڕیارە ناوەندی توێژینەوەی کشتوکاڵی و ژینگەی سنە بڵاوی بکاتەوە. ئەم فلۆرە بریتییە لە هەموو گژوگیای سنووری پارێزگای کوردستانی ئێران ـکە هەر چەند ئەژمارێکی زۆر لە جۆرەکانی ڕووەکی ئەم سنوورە لەتەک شارە کوردنشینەکانی پارێزگاکانی دیکە و تەنانەت باشووری کوردستانیش یەکسانەـ و داگری ١١٣ بنەماڵە، ٦٢٩ جنس و ٢١٠٠ جۆری ڕووەکە. بەپێی بۆچوون و لێکدانەوەی پرۆفیسۆر ئەحمەدی قەهرەمان، تەنیا وڵاتی ئێران نێزیک بە ٨٠٠٠ جۆر ـ واتا تا ساڵی ١٣٨٣ـ ڕووەکی لێ تۆمار کراوە و بەرابەرە لەتەک کۆی ڕووەکی گشت ئورووپا و دووبەرابەری ئورووپای ناوەندی. لە کۆی ٨٠٠٠ جۆر ڕووەکی ئێران تەنیا نزیک بە ١٧٥٠ جۆر ڕووەک تایبەتی خۆیە (ئێندێمیک). فلۆری پارێزگای کوردستان ٢٥٪ (بانتر لە ٢٠٠٠ جۆر)، ئیلام ١٥٪ (١٥٠٠ جۆر)، کرماشان ١٨٪ (١٨٠٠ جۆر) و ورمێ ١١٪ (بانتر لە ١١٠٠ جۆر) فلۆری گژوگیای ئێرانیان هەڵگرتووە.

ساڵی ١٩٦٥ لە ئەنجامی ڕێکەوتنامەی نێوان بنکەی ڕووەکناسی کیوو لە بریتانیا و وزارەتی کشتوکاڵی عێراق، دەست بە نووسین و داڕشتنی فلۆری عێراق کرا. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٦ تا ١٩٨٥ بە سەرپەرشتی ڕووەکناسان شاهین غەزەنفەر و ( John Edmondson) کۆی ٣٣٠٣ جۆر ڕووەک لە سنووری ناو عێراق کۆ کرایەوە کە نزیک بە ٩٠٠ جۆری تەنیا تایبەتی فلۆری عێراقە واتا بە جۆرەکانی ئێندێمیکی عێراق دەناسرێن. سەرجەم ١٧٨٣ جۆری لە بەرگەکانی ١، ٢، ٣، ٤ (بەشی ١ و ٢)، ٨ و ٩ چاپ بوون، هەروەها ساڵی ٢٠١٢ دیسان لە لایەن بنکەی ڕووەکناسی کیوو ١٥٢٠ جۆری دیکەی کۆکراو لە بەرگەکانی ٥ (بەشی ١: Chenopodiaceae & Caryophilaceae و بەشی ٢: Apiaceae)، ٦ (Asteraceae) و ٧ ( Lamiaceae, Convolvulaceae & Boraginaceae) لە درێژەی ئەو ڕێکەوتنامەیە بە چاپ گەیشت. خاڵی گرینگ لە فلۆری عێراق ئەمەیە کە بەهۆی کێشە و شەڕەکانی دەرەکی و ناوەکی لەم وڵاتە، پاش ساڵەکانی ١٩٨٥ کەمتر ئاوڕیان داوەتەوە لە تازە کردنەوە و زیاد کردنی سەرژمێری فلۆری عێراق.

سالی ١٩٦٥ وزارەتی کشتوکاڵی تورکیە و زانکۆی (Edinburgh) ئیسکاتلەند کاری کۆکردنەوە ڕووەکەکان و فلۆری تورکیە دەستی پێکرا. سەرپەرشتیار و بەرپرسی زانستی ئەم کارە بە ئەستۆی ڕووەکناسی گەورە (Peter Davis) بوو. لە ئەنجامی توێژینەوە و گەڕانەکانیان تا سالی ١٩٨٨، سەرژمێری و کۆکردنەوەی ٩٠٠٠ جۆر ڕووەک لە سنووری ناو تورکیە بوو کە لە ١٠ بەرگدا چاپیان کرد. سالی ٢٠٠١ بەرگی ١١ لەم فلۆرە لە لایەن ڕووەکناسی تورک (Adil Guner) کە تەنیا نزیک بە ٣٠٠٠ جۆری تایبەتی فلۆری تورکیایە و بە جۆرەکانی ئێندمیکی ئەو فلۆرە دەناسرێن، چاپ کرد. دەیویس هەروەها پێش فلۆری تورکیا بۆ توێژینەوە و پێناسە کردنی فلۆر سەردانی سروشتی کوردستان و ڕووسیایشی کردبوو. بەم بۆنەیەوە سالی ١٩٥٩ لە لایەن ڕێکخراوی جوغرافیایی پاوشایی بریتانیا خەڵاتی تایبەتی وەرگرت. ڕێچکەی کاری ڕووەکناسانی ناوخۆی تورکیا لە پاش کۆکردنەوە و توێژینەوەکانی دەیویس دەستی پێکرد. تا سالی ٢٠٠٠ نزیک بە ٣٠٠ جۆر ڕووەکی تازە پاشکۆی فلۆری تورکیا کرا، واتا کۆی گشتی فلۆری تورکیا بە ٩٣٠٠ جۆر ڕووەک گەیشت.

بەشی فلۆری تایبەت بە سنووری وڵاتی سووریە دەکەوێتە ناو فلۆری سینا، سووریە و فلیستین کە سالەکانی ١٨٣ تا ١٨٩٦ بە سەرپەرستی ڕووەکناس (George Edward) زانکۆی پرۆتێستانی سووریە سالی ١٩٣٠ چاپی کرد. هەر چەند ئەم فلۆرە بۆ ڕووەکناسان چەشنی ژێدەرێکی باوڕپێکراو نییە. چونکە سەردەمی کۆکردنەوە و نووسینی فلۆری ناوبراو زۆربەی یاسا و پێڕەوەکانی ڕووەکناسی و ناونیانی ڕووەکی تێدا نەبووە، بەڵام دەکرێت چەشنی سەرچاوەیەک بۆ نموونەکانی کۆکراوە و ناسێندراوی ئەو سەردەمە سوودی لێ وەربگیردرێ. سالی ١٩٧٠ ڕووەکناس (Pere Mouterde) فلۆری (Mouterde) نووسی کە داگری سەرجەم ڕووەکەکانی سووریە و لوبنانە. بەپێی ئەم فلۆرە ٣٠٧٧ جۆر ڕووەک تایبەتی سروشتی سووریایە، هەروەها ٣٠٤ جۆر بە جۆرەکانی ئێندمیکی سووریە دەناسرێن.

بۆ نووسین و دانانی "فلۆری کوردستان" پێویستە ورد و تۆکمە هەموو لاپەڕەکانی فلۆری ئێران، تورکیە، سووریە و عێراق هەڵبدرێتەوە. بەرهەم هێنانی ئەم فلۆرە پشتیوانی و هاریکاری حکوومەت و دڵسۆزانی ڕووەکناس لە بنکەکانی توێژینەوەی کشتوکاڵی و ڕووەکناسی گەرەک دە-بێت. بەرهەمی "فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان" دەتوانێت چەشنی بەردی بناغە و هەروەها ڕچەشکێنی فلۆری کوردستان بەکار بهێنرێت. بەپێی ئەو ژماردن و ئامارەی لەم پەرتووکە بەدە-ستم هێناوە، سەرجەم جۆرەکانی ڕووەک لە پارچەکانی کوردستان بریتین لە: ڕۆژهەڵات (٩٥٪)، باشوور (٥٥٪)، باکوور (٤٠٪) و ڕۆژاوا (٢٥٪). ئەگەرچی ڕێژەیەکی زۆر ڕووەک ـکە لە قامووس و سەرچاوەکاندا هاتوون- بێ بەرامبەری ناوی زانستی یا کوردی ماوەتەوە کە ئەگەر لە داهاتوو کاری زۆرتریان لە سەر بکرێت جەماوەری ڕووەکی کوردەواری زۆرتر دەبێت.

پێڕەو کردنی ڕێچکەی ناوی زانستی لە پاڵ پاراستنی ناوی کوردی پەسەندکراو، کارێکی ژیرانە و سەردەمیانەیە کە مرۆڤی کورد لە ئاکارەکانی شەڕەگەڕەک و ناڕێکەوتن

دەپارێزێت. دیارە دنیای ئەورۆ وردبینانە دەڕواتە نێو ناسینی هەموو جۆرەکانی ڕوەک. خوێندکاران و توێژەرانی تاقیگە هەتا وردترین جیاوازی نێوان جۆرەکانی گیا دەکۆڵنەوە. چونکە ئەمان پێی گەیشتوون کە ڕوەکەکان تەنیا لە ڕووی جیاوازی ڕەنگ و بیچمی گوڵ و گەڵا جیا ناکرێنەوە. واتا پێناسە کردن بەگوێرەی ڕواڵەتی گیاکانیان تێپەڕاندووە و خۆیان خەریکی بواری ژنێتیک و سەر مولوکوولەکان کردووە. جا ئایا ئێمە لەم بوارە مەزنەدا پێویستمان بە خۆ هاوڕێک کردنی زوانی دایکیمان لەتەک ڕێچکەی زانستی سەردەم نابێت؟ بۆیە ئێمەیش بەم چەشنە وەکوو گەلانی دراوسێ خۆ هاوڕێک و هاوڕێی زانستی سەردەم دەکەین و ناوی زانستی و کوردی چەشنی دوو برای هاوزێن و هاریکار دەخەینە کایەوە.

لەم سالانەی دوایی لە ئێران پرۆفیسۆری ڕوەکناس دکتۆر موزەفەریان، لە بەرهەمەکەیدا ڕچەی ئەم ڕێچکەیە بۆ زوانی فارسی شکاند. هێندێ لە وردەکاری ڕێنامەکەی بەم شێوەیە باس دەکات: «ڕوەکی وا هەیە لە باشووری ئێران شین دەبێت و لە سەرچاوەکان ناوی تورکی یان عەرەبی بۆ نووسراوە یان زۆر ناوی دیکە کە جێی باوڕ و متمانەی زانستی و فەرهەنگی زوانی فارسی نیین، هەروەها دەبینین ناوێک بۆ دوو یان چەند جۆر ڕوەکی جیاواز هاتووە. ڕاستیەکەی ئەوەیە بەگشتی لە ئێران بۆ زۆربەی گیاکان تەنیا ناوێکی فارسی یان زۆر جاران ناوی نەژاد (Genus) یان ناوی جۆرێکی(Species) ئەو نەژادە بەکار دەبرێت. بۆ نموونە، بانتر لە ٥٥ جۆری Ranunculus بە (آلاله: چنارەکەڵە) دەناسرێت لە حاڵێکدا ئەم ناوە تەنیا بۆ یەک جۆری ئەم گیایە پەسەند و دروستە، ئیدی جۆرەکانی دیکە ناوی فارسیان نییە یان بۆ ٨٣ جۆری Acantholimon ناوی (کلاه میرحسن: ئەولیاگەون) دانراوە و ناوی جۆرێکی تایبەتی نییە. بۆ چارەی ئەم کێشەیە هێندێک لە توێژەران لەم ئاخرانەدا شێوازی «جۆرێکی ئەولیاگەون» یان «جۆرێکی چنارەکەڵە»یان داناوە کە ئەمەش کێشەی ناونیانی ڕوەکی چارەسەر نەکرد».

**پێوەندی پێناسەی ڕوەک و فەرهەنگی وێژە**

وێژەوانان دەڵێن: وێژەی زوانی هەر گەلێ چەشنی زەریایە و بوارەکانی زانستیش وەکوو ماسی و زیندەوارەکانی ئاوزێن. پسپۆڕانی بوارە جیاوازەکانی زانست لە هەر وڵاتێک، تێکڕا بەهۆی یەک زوانەوە ئەویش زوانی فەرمی و دایکی- پێوەندی دەکەن و لێک تێ دەگەن. ئەگەر لە هەر بوارێکی زانستیدا زانایان لە ئاراستەی خۆیانەوە بجووڵێن و خزمەت بە وێژەی گشتی زوانەکەیان بکەن ئەوە زوانی دایکیان هەمیشە چەشنی ئاوێکی ڕوون دەبێت و لە زوانی گەلانی دیکە ئامێتە یان نوقم نابێت. دیتنەوە و دانانی وشەی نوێ بۆ وشە دەرەکیەکان چەشنی خاوێن کردنەوە و دۆزینەوەی کانیەکانێ بۆ ناو زەریای وێژەکەمان. ئێژن: کۆڕی زانیاری لە ڕووسیا هێندە دەسەڵاتی هەمەلایانەی هەیە کە پێش ئەوە وشەیەکی دەرەکی لە کۆمەڵگادا باو بێت، وشەی هەمبەری ڕووسی بۆ دادەنرێت.

زانستی ڕوەکناسی دەتوانێت بۆ پێناسە و پەرەپێدانی سروشت، لە بوارەکانی وێژەیی، کشتوکاڵی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و دەروونی مرۆڤ خزمەت بکات. ئەگەر لە بواری

وێژەییەوە ئاوڕ لەم باسە بدەینەوە، دەبینین سروشت بەتایبەت کۆمەڵی ڕووەک چەشنی چەمکێکی ناسک بۆ ژیانی مرۆڤ دەرکەوتووە. لە فەرهەنگی کوردەواریدا گوڵ نیشانەی ئەوپەڕی ڕازاوەیی و جوانییە، پەلک دروشمی نرخداری تەمەنە، ڕیشە سەرەتای وردبینی و گرینگی ژیانە، میوە هەمان دەسهاتە، ناوی مێوینە و هەموو شتە هەستیارە دەروونیەکانیش لە گوڵ و ڕەنگامەی سروشت وەرگیراون، وەکوو: شیلان، وەنەوشە، چنوور، هەلالە و گولالە.

هەندێ لە پسپۆرانی ڕووەکناس باوڕیان وایە کە پێویستە تەنیا گرینگی بە ناوی زانستی بدرێت و ئیدیدەس هەڵگرین لە ناوی خۆماڵی و نیشتمانی بەلام ئایا بەم شێوەیە داهاتووی زوانی دایکیمان چی بەسەر دێت یان زوانی خەڵکی ئاسایی بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئێمە دەتوانین سەیری ئەزموونی ولاتانی فارس و عەرەب بکەین و داهاتووی هاوڕییەتی ناوی زانستی و کوردی خۆمان ببینینەوە. بە گوێرەی دەسکەوتەکانی پرۆفیسۆر ئەحمەدی قەهرەمان تەنیا ۲۵۰۰ جۆری ڕووەک تایبەتی ناو سنووری ئێرانە و بە جۆرەکانی ئێندمیکی ئێرانی دەناسرێن، واتا پێویستە هەرکام ناوی فارسیان بێت بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە زۆربەیان پێناسەی فارسیان نییە. سالی ۱۳۸۵ هەتاوی دکتور موزەفەریان لە بەرهەمەکەی (اسامی گیاهان ایران) ناوی هەموو جۆرەکانی گژوگیای ئێرانییە سێ زوانی فارسی و ئینگلیسی و لاتین پێشکەشی بازاڕ و کۆڕی زانکۆکان کرد. هەر وەک خۆی لە پێشەکی کتێبەکەی ئاماژەی پێ کردووە، ئامانجی سەرەکی پاراستنی ناوی فارسی ڕووەکەکانی ئێرانە. هەروەها ئەگەر سەرێک لە کارنامەی وانە و کاری پرۆفیسۆر ڕاشد موحەسێل -کە یەکێ لە ئەندامانی سەرەکی دامەزراندنی لقی وانەی گیابژارەکانی زانکۆیە و ئاستی هەرەبەرزی وانەی هەیە بۆ خوێندکارانی بواری کشتوکاڵی لە پلەی کارناسی بالا و دوکتۆریدا- بدەینەوە بۆمان دەردەکەوێت نرخ و هێژاییێکی زۆر بەرامبەر ناوی فارسی ڕووەکەکان لە پەرتووک و وتارە زانستیەکانیدا دیارە. لە دەرفەتێ کە دوو وانەی گرینگی ماستری لە خزمەت پرۆفیسۆری ناوبراودا بووم ئەم ئەزموونەم بە ڕاشکاوی هەست پێ دەکرد.

پرسێکی دیکە بۆ گرینگی ئەم بوارە، دابین کردنی بەستێنی بانگەشە و نیشاندانی ناوی کوردی ڕووەکەکانە لە سەر بەرهەمەکانی بازرگانی و تەندروستی خواردن و دەرمانی سروشتی. هەروەها لە ڕێگای ناوەرۆکی وتار، پەرتووک، ماڵپەر، ڕاگەیاندن و کارگەکان ئەرکی پاراستنی زوانی دایکی و پەرەپێدانی بواری ڕووەکناسی لە بیر نەبەینەوە.

**بە بۆچوونی من، ڕەچاوکردنی ئامانجی سەرەوە پێویستی بەمژارەکانی ژێرەوە دەبێت:**

- مامۆستایان و خوێندکارانی زانکۆ و ناوەندەکانی توێژینەوەی ڕووەکناسی ناوچە کوردنشینەکان، چەشنی سامانێکی نیشتمانی بەرامبەر بە ڕووەک بجووڵێنەوە.
- چالاکانی بواری فەرهەنگی و وێژەیی کوردی کە هۆگری باری گژوگیان، هەوڵ بدەن پردێکی پێوەندی لە نێوان خۆیان و دەسکەوتەکانی زانستی مامۆستایان و خوێندکاران پێک بهێنن.

- ناوەندەکانی توێژینەوە و مەزرینگەکانی کشتوکالی و ژینگەیی بە پێویستی بزانن کە چەشنی کەلەپووریکی کوردی، نموونەی وشک یان وێنە و فیلمی گژوگیای دەوروبەری خۆیان هەڵگرن هەتا یاریدەری هێرباریۆم و مۆزەخانەی سروشتی ولاتەکەیان بن.
- ئەگەر خوایکرد و ڕۆژێ بوو ناوەندە پێوەندیدارەکان لە هەموو کوردەواری بەتایبەت ئیلام، کرماشان، سنە، مەهاباد، ورمێ، دیاربەکر، وان، دێرسیم، بۆتان، هەکاری، ماردین، قامیشلۆ، کۆبانێ، کەرکووک، خانقین، شەنگال، هەولێر و سلێمانی بەو ئاستە گەیشتن کە دەبێ فەرهەنگ و سەرچاوەیکی گشتی ڕووەک دەستەبەر بکەن بۆ سامانی سروشتی ئەم نیشتمانە، ئەوە پێویستە لەپێشدا زۆر کار و هەرمانی ورد و درشت (وەکی تۆمار کردنی نێوی گیاکان لە هەموو زاراوە و ناوچەکان، وێنە و ناونیشانی ڕوان و شینبوون، هەمبەری ناوی زانستی و کوردی و هتد) ئامادە بێت.

***

ئێژن: کاری هێند گەورە تەنیا شیاوی گەورەکانە. ئەمە تەنیا پەیڤێکە پڕ بە پێستی نووسینی فەرهەنگ و هەگبەی زوانی هەر نەتەوەیک یان دەگوترێت نووسینی فەرهەنگنامەی گشتی، پێویستی بە هاویاری و هاوڕاوێژی دەستەی لێزان و پسپۆڕانی ناو سنووری یەک ولاتە. نموونەی ئەم قسانە زۆرن و بوێژیان مشەمەرە بەلام تا کەنگێ بە هیوای هاتنی سرووشی ئاسمانی و فریاڕەسی هەندەران دابنیشین تا هەموو کۆت و بەندەکانی مادی و مەعنەوی نێوان پیاوەزن و پسپۆران بپسێنێ و کۆڕیکی لەبار و تەبا بۆ ئەم نیازە نیشتمانییە پێک بهێنێ. ئاواتێکی نسک و ناهمێیە. ناشوکری نەبێت سنوورەکانی جوغرافیایی، ڕامیاری، زانکۆ و ناوەندەکانی کوردەواری هێند زۆرن کەم کەس فریای بەشداری لەم کۆڕەیدا دەبێت.

پاش چەند ساڵ کۆکردنەوەی زانست و ئەزموون بەو قەناعەتە گەیشتم کە دەتوانم هێندێ لەم ڕێگایە بێپوم و بەرهەمێ هەر چەند کەمایەسیدار بگەینمە جێ. ئیدی دەستەنیا چوومە چەقی ئەم گۆڕەپانە و بۆی دانشتم ورد و درشتی ئەم خەرمانەم جەز کرد. جا ئێتر کورد وتەنی: "تەڕە، هەسە، هەر ئەمەسە!" بەلان بە دڵ پێی گەیشتووم و باوڕم کرد ئەم کارە کەموکوڕی زۆری تێدایە و پێویستی بە ڕێنوێنی و ڕێنامەی تاک و کۆمەلانی شارەزای زۆر دەبێت. کەوابوو بۆ لابردنی کەمایەسیەکان بەردەوام ئامادە بووم بۆ قسە و بۆچوونی دۆستان و مامۆستایانی دەوروبەرم و ئێستاکەش دیسان ئامادەم بۆ جێبەجێ کردنی ڕەخنە و پێشنیار و هەلەگری دژواری یاران و وەرگرتنی تیر و توانجی نەیاران. بۆیە تکایە خوێنەران ـ هەرچەند بە ئەرکیش دەبێت ـ لە هەر لاپەڕە و شوێنێکی ئەم پەرتووکەدا هەڵە و ناڕاستی و شێواوییەک کەوتە بەرچاویان یاخود پێویستی بە پێشنیار و بۆچوون و ڕەخنەی هەبوو ئەوە دەسبەجێ لە ڕێگای ناونیشانەکان ـ کە لە کۆتایی ئەم پێشەکیەدا هاتووە ـ بۆم بەرێ بکەن، لە سەرچاوی

دادەنم و بۆ چاپەکانی داهاتوو ڕەچاوی دەکەم. چونکە بەڕاستی ئەم پەرتووکە بێهەڵە نییە و پێویستی بە یارمەتی و دەسگرتنی ئێوەی بەرز و بەڕێز هەیە.

**ڕەوتی کۆکردنەوە و نووسینی ئەم پەرتووکە**

لە ئامێزی گژوگیای لادێ تێکڕای سینگی پڕ وشە و ناوی ڕەسەنی جەماوەری کوردەواری گەورە بووم. هەر بە منداڵی بە توورەکە و قوتووی ڕەنگاوڕەنگی گوڵی دەوایی و گیای ناوچێشتی دایکم ئاشنا بووم. جاری وابوو بەتایبەت بەهارانە، لەتەک ئەم شۆڕەژنە گیاناسە بۆ گیابرژێوە دەچووینە دەشت و کێو. جا پرساپرسا فێری ناوی زۆر گژوگیای گوندی خۆمان ـباقلاواـ بووم. هاوشانی باوکم لەگەڵ بژار کردن و گیادوورین ساڵ بە ساڵ کۆگای ئەم ئەزموونەم هەڵدەچنی. هەروەها هاوینانە و کاتی پشوودانەکانی قوتابخانە بە نێو نسار و خۆرەتاوی کەوشەنی دێ تێکڕای هاوتەمەنان و گاوان و شوانانی لادێ بۆ بەرغەلەوانی گەلێک وشەی ئەم بوارە فێر بووم. ئەتوانم بێژم ئەم ژینامە کورتەڵەیە، بوو بە بەردی بناغەی کاری داهاتووم و بەستێنی هێزەکی بۆ توێژینەوە و نووسینی ناوی گیاکانی کوردەواری.

بۆ خوێندنی داواناوەندی چوومە هونەرستانی کشتوکاڵی شاری سنە. لەو ساڵانەدا بوو بە نووسین و خوێندنەوەی زوانی دایکیم لای هۆنەری گەورە ماموستا شەریف چاوم ڕوون بۆوە. سەرەتا هێندە سەرقاڵی خوێندنەوەی پەرتووکی کوردی بووبووم لەوانە بوو وانەی خۆم لە بیر وەچێت. خاڵێکی‌تری هاندەر بۆ ئەم کارە ئەوە بوو جارجارە لە زاری مامۆستایانی بەشی کشتوکاڵی هونەرستانم دەبیست کە هەمبەری کوردی ڕوەکەکان ئەمانە دەبن: بۆژانە، شیلان، هێرۆ، پەلک، نیسک، خوشیلک، هەڵیترگ و هتد. پاشان بە بەردەوامی تێدەکۆشیم هەمبەری گیاکان لە زاری هاوپۆلانم ـکە لە هەموو بنزاراوەکانی کوردی شارەکانی پارێزگای کوردستان بوونـ هەڵگرم و فێریان بم.

وردەوردە پەیجۆری ئەم خولیایە بووم هەتا ڕۆژبەڕۆژ فرەتر بۆ فێربوونی ناوی کوردی گیاکان ئاشنا دەبووم. بەم شێوەیە بەو ئاستە گەیشتم کە نێوی کوردی هەموو گیاکانم لە پەرتووکەکانمدا نووسیبوو. ئەو کاتە بیرم لەوە دەکردەوە، ئاخۆ پەرتووکێ نەبێت بە شێوەی زانستی و ڕێکوپێک نێوی کوردی هەموو ڕوەکی کوردەواری تێدا نووسرا بێت. پاشان هەستام و هەموو پەرتووکفرۆشەکانی ناوشارم پشکنی. سەرەتا هەستم دەکرد هێشتا لە بواری ڕوەکناسی کوردی ڕچە نەشکاوە ـ ئاخر منداڵ بووم و ڕوانگەی ئاوەزی تەمەنم هەر ئەوەندەی دەبڕیـ بۆ خۆم دەمگوت: من دەتوانم کارێک بکەم چەشنی ئەو کارانە لە ناو فارسەکاندا کراوە. پاشان پرساپرسا بە فەرهەنگ و پەرتووکگەلێ گەیشتم و بۆیان دانشتم و مرخم لێیان خۆش کرد و وە-بەر خوێندن و هەڵسەنگاندنم دان. ئیدی بە یەکجاری وەکی خوێندەوارێکی تامازرۆ، دەستم دایە کۆکردنەوە و دۆزینەوەی ناوی کوردی گیاکان و هەمبەرەکانیان لە فارسی و لاتیندا.

ئاشکرایە تێخزانی کەڵکەڵەیکی ئاوەها لە مێشکدا، با ئەزموونی ژیانیش هێمان زۆری دنیا نەبڕیبێ و لە جەرگەی ئاواتە بەرزەکانی گەنجیدا نوقم بێت، بەڵام ئاواتی دەرکەوتنی

پەرتووکێکی ڕووەکناسی کوردی بۆ گیادەرمانی و پاراستنی فەرهەنگی نەتەوەیی، بوو بە کەڵکەڵەی ژیانم و ئاقاریکی فرەی لە هەگبەی هیواکانی داگیر کردم.

وێڕای ئەزموونی کاڵ و کرچیم، بە کەم ئاوردانەوەی پسپۆڕانی ڕووەکناسی و گیادەرمانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان گەیشتم. بۆیە هیوام بەست بە کاری زانکۆ و بنکە تایبەتی و زانستیەکانی کشتوکاڵی و ژینگەپارێزی بەشی باشوور. سەردەمانێک هەر کەسێکی ناسراوی شارەزا و ناشارەزا بۆ هەولێر و سلێمانی دەچوون پێیانم دەسپارد بەشکوو بگەڕێن و بپرسن لە بواری ڕووەکناسی و گیادەرمانیەوە پەرتووکێکم بۆ وەبینن، بەڵام چ بکەم بەشی ئەم لا و ئەو لای ماڵی کورد هەر ڕووتی و پەتی بوو. لەم دواییانەشدا بۆ خۆم بە تەسەلی چەند ڕۆژ لە بازاڕ و زانکۆکانی هەولێر و سلێمانی گەڕام، کەچی دۆخ هەمان دۆخی جاران بوو.

لە ماوەی ئەم ساڵانە هەستم بەوە کردبوو کە کاری دانان و دەرهێنانی فەرهەنگێکی ڕووەک، پێویستی یەکجار بە پشکنینی کوێستان و گەرمێن و دانشتن لە لای پیران و دانیشتوانی گوندی کوردەواری هەیە. هەروەها خوێندنەوە و شیکردنەوەی هەرچی پەرتووک و پەڕاوی کوردی و بیانییە کە لە بواری ڕووەکناسیەوە کراوە. بۆیە بە دانیانی ئەم بەرهەمە بەقەدەر شانی خۆم لە قورسایی ئەم بارەم کەم کردۆتەوە و بۆ پوختە و پەرەپێدانی ئەم کارە هەتا بتوانم لە داهاتوویشدا تێدەکۆشم.

پاش دوو ساڵەی یەکەمی خوێندنی گیاپزشکیم لە زانکۆی ساری، گەیشتم بە خزمەت بەرایی پەرتووکی ڕووەکناسی لە کوردەواری (کارەکانی کاک ئەمیری ئەمینی و کاک شەهابی خزری). ئەمجارە لە بەر خوێندنیان دانشتم و لاپەڕەکانیانم وەکی پەرتووکەکانی پۆلی یەکی سەرەتاییم بە سەردا هێنان. بە دەرچوونم بۆ پلەی کارناسی ڕەزگەری زانکۆی کوردستان، چوومە نێو دەستەی نووسەرانی فەرهەنگی گەورەی (فارسی‌ـکُردی دانشگاه کردستان) بە سەرپەرشتیاری کاک ماجدی ڕۆحانی. تێکڕای ئەو کارانە کە لەو فەرهەنگە بەنرخەدا ئەنجامم دان، بەشی ڕووەکناسیشم لە ئەستۆ گرت. پاش چاپدانی فەرهەنگی نابراو پوختەی کاری چەند ساڵەم بوو بە نامیلکەیکی فارسی ـ کوردی دار و دەوەن و گیا و گوڵی کوردی.

پاش هەلی پڕبەهرەی دانشتنەکانی فەرهەنگنووسی و کەڵک وەرگرتن لە خزمەت ئەزموونی کاک ماجد و هاوکاران، خۆم بۆ گرانباری و هەستیاری کاری فەرهەنگی ڕووەکی گەلەکەم ساز کرد. ماوەی چوار ساڵ کاری فەرهەنگنووسی زانکۆی کوردستان بە ڕاستەقانی زۆر کار و کێشەی گەلی کورد گەیشتم و لە سای درگای ئاوەڵای دانشتنەکانی فەرهەنگنووسی ـکە کەسانێ بە جۆرێ خاوەنی کەڵکەڵەی فەرهەنگی کوردی بوون، بۆ جارێ یان چەند جار هاریکارمان دەبوون. گەلێک ئەزموونم بە دەست هێنا و نرخ و هەژیانی کاری بەکۆمەڵم بۆ دەرکەوت. چوونکا قسەی هەمیشەی کاک ماجد بوو کە کارێک کەموکوڕیەکانی دادەبەزێت کە بەکۆمەڵ بکرێت یان کاری زانستی و تایبەتی ئەشێ دەستەی پیاوانی زانستمەند و بەئەزموونی خۆی بیکەن. جا وێڕای ڕەچاو کردنی ئەم ڕێنوێنیە بەرزە، بۆ

نووسینی ئەم فەرهەنگە هەمیشە دەستەوداوێنی زۆر کەس وەکوو ڕووەکناس، خوێندکار، شارەزای ڕووەک و کوێستان، عەتار و گیافرۆش بووم. هەموو پچڕپچڕ و دوورادوور بە ڕۆژێ یان چەند ڕۆژ هاوشان و هاریکاریان کردووم، بەڵام ئێستاکەش باوەڕم وایە ئەم کارە ئەگەر پوختەتر بکرێت دەبێ کۆمەڵێکی گەورەو شارەزا و لێزان لێی دانیشن یان بەو هیوایە بنکەیەکی تایبەتی فلۆرای کوردستان لە شوێنێک وەکوو یەکێ لە زانکۆکانی کوردستان یان لە تەنیشت کۆڕی زانیاری (ئاکادمیای) کوردی لە هەولێر بۆی بکرێتەوە.

بۆ تێپەڕاندنی سەربازی چوومە مەزرینگەی کشتوکاڵی چنارە و جانەورە سەربە شاری مەریوان. هەلێکی ڕەخساو بوو، سەردانەکانی کارناسیمان بۆ لادێیەکان و گەڕان بە نێو کوێستان و بێستانی ناوچەی سەرشیو و بەرپلەی ساراڵ و هەروەها وەرگرتنی ئەزموونی کارمەندانی مەزرینگە، قازانجێکی تەواوی بۆ کاری من هەبوو. دوابەدوای سەربازی بۆ خوێندنی کارناسی باڵا (ماستەر) لە بەشی زانستی گیابژارەکان چوومە زانکۆی بیرجەند. لەم قۆناغە چوومە ناو بواری ئەزموونی‌تر، وەکوو: دەرفەت و هەلی زۆرتر بۆ گەڕان و پشکنینی هەموو ماڵپەڕە کشتوکاڵی و وێستگە توێژینەوەکانی ڕووەکناسی بۆ دەسکەوتی نوێی ڕووەک لە ڕۆژاوای ئێران یان بەگشتی کوردستان، بایەگانی کردنی ئەنجامەکانی ڕووەکناسی و گیاگەلی داروویی خوێندکارانی کارناسی و کارناسی باڵای زانکۆکان لە ناوچە جۆراجۆرەکانی ئێران، پرسینەوە بۆ وەدۆزینی ناوی فارسی و لاتینی گەلێک جۆری گیا (جاری وابوو بۆ ئەم بەشە دەچوومە لای پرۆفسۆر حەسەن ڕاشد موحەسل و مامۆستایانی بەشی تاقیگەی ڕووەکناسی زانکۆی بیرجەند یان هاوپۆلانی شارەزا لە زانکۆ)، کۆکردنەوەی پرۆژە و وانەکانی پرۆفیسۆر موحەسل لە بواری ڕووەکناسی و بژارناسی، ئەنجامی پرۆژەی گیابژارەکانی باخ و مووچەکانی دەڤەری بیرجەند بۆ مەزرینگەی کشتوکاڵی و گەلێک کاری جیاجیای دیکە کە هەموو هۆکارەکانی یاریدەر و وزەبەخش بوون بۆ ئەم کارە.

پاش خوێندنی کارناسی باڵا، هاتمە شاری سەردەشت و هێدی‌هێدی چوومە ناو بازاڕی کار و بژیوی ژیان. ئیدی بە سووک بوونی دەرس و دەور، دانشتم لە پای ڕێکوپێک کردنی پەڕاوە و نووسراوەکانم. شوکر بۆ خوا لەم قۆناغەیشدا لەگەڵ خەڵکی لادێیەکانی سەردەشت لە بەشدارگەکانی خزمەتگوزاری کشتوکاڵی بنار و بیمەی ڕەزگەری بانکی کشتوکاڵی گەلێک زانیاری دیکەم هاویشتە ناو هەگبەی وشەدانەکە.

خوێنەرینە! ئەگەر دەتەوێت ناوەرۆکی ئەم بەرهەمە هەڵەی تێدا نەمێنێ و پوختە و پاراوتر بێت، تۆخوا بە قسەی ئەم برالەیەت بکە و ڕاسپاردەکانی خوارەوەم ڕەچاو بکە:

- هەموو کاری نووسینەوە و پیتچنی خۆم کردوومن، جا لە هەڵەکاری دوور و پەتی نییە (هەڵە لە فەرهەنگ‌نووسیدا چەشنی وایرووسە، ئەگەر لە چاپی داهاتوو نەسڕێنەوە هەموو پەڕە و زاری کۆمەڵگا دەگرێتەوە)؛

- دەزانم ئەم پەرتووکە لە هەموو شار و گوندەکانی کوردستان خوێنەری دەبێت و هەموو خوێنەران هاوزاراوە نیین، ئاشکرایە: هەمبەری کوردی لە هەموو زاراوە و شێوەزارەکانم نەنووسیوە؛
- شوکر بۆ خودا نیشتمانی کوردەواری هێند بەربلاوە کە بەقەد چەند ولاتی ئوروویایی و عەرەبی دەبێت. جا ڕەنگە لە نووسینی کوردی شار، گوند، کێو و ناوچەکان تووشی هەڵە بووبێتم یان هەمان زاراوەی فارسی، تورکی و عەرەبیم نووسیبێ؛
- هەندێ لە ڕووەکان کە تازە ئاستی جۆر و ژێرجوری ڕووەکناسیان بەدەس هاتووە و گیاناسان ناوی زانستیان بۆ داناوە بەلام هێشتا ناوی کوردیان نییە، لەم پەرتووکە بە نیشانەی (....) بێ‌هەمبەر هاتووە؛
- بەقەدەر خوێندەواریم پێشەکی ئەم پەرتووکەم نووسیوە، جا ڕەنگە خوێنەران پاژ و باری دیکەیان پێ بێت؛
- لە بەشی هەمبەری ناوە زانستیەکان، تێکۆشیوم سەرەڕای زۆربەی هاوناوەکان، دوایین ناوی پەسەندکراو بهێنم و سەرەتا بە پێنووسی بولد بینووسم. دیارە خوێنەری پسپۆڕ، ئێستاکە یان داهاتوو تووشی ناوی پەسەندکراوی دیکە دەبێتەوە یان خێراتر قامک لە سەر هەڵەی زانستی دادەنێت؛
- بۆ ئەم کارە زۆر هەوڵم داوە بەشکوو هەندێ سەرچاوە و دەقی وتاری ڕووەکناسی کە سەبارەت بە بەشەکانی سروشت و ڕووەکناسی کوردەوارییە لای تورک و عەرەبەکان، بەدەست بێنم بەلام زۆر سەرکەوتوو نەبووم؛
- تا ئەو جێگەیە توانیبێتم سەرچاوەی شینبوونی ڕووەکەکانم بێ بەڵگە نەهێناوە و ناونیشانی یەک یان چەند ژێدەرم هێناوە. جا ڕەنگە ڕووەکێ لە زۆر جێگا شین ببێت و ئەمن ناوی هەمووانم نەهێنابێ. بۆ ئەمە تووشی سەرقاڵی و هەڵەکاری متمانەی زانستی کارەکە نەبم تەنیا کارم بەو ژێدەرانەوە بووە کە لە بەردەستمدا بوون (ئەگینا زۆر جۆری ڕووەکم لە گەلێک ناوچە و چیادا بەرچاو کەوتووە، تەنیا بۆ پیویست ـکە ڕووەکێ سەرچاوەی ڕواوگەی کەم بووبێت. دەسکەوتی خۆم بۆ نووسیوە)؛
- بەشی ڕواوگە بۆ ڕووەکەکانی بەشەکانی کوردەواری (بەڕیزەوە) لە ڕۆژاوا، باکوور و باشوور نیازی بە کارکردنی زۆرتر هەیە؛
- بەو هیوایە لە داهاتوو دوو بەشی گەورە و گران پاشکۆ بکەم واتا وێنەی ڕووەکەکان و بۆ هەر ڕووەکیش بەندێکی دیکە بە ناوی «تایبەتمەندی هەتوان و سارێژ» ـکە بە هەموو شێوە گیای نابراو لە فەرهەنگی ژیان و پزیشکی کوردەواری (KTM) هاتووە. بینووسمەوە؛

(لێرەدا جێی خۆیەتی کە بڵێم: ئێستاکە تەنیا کەسێ لەم کوردستانە قۆڵی لێ هەڵماڵیوە و بناغەی بەرنامەی هێنانە ناو چوارچێوەی زانست بۆ پزیشکی خۆماڵی کوردەواری داناوە؛ حە-

کیم کاک بورهان حوسەینیە. ئەم پسپۆڕەی بواری گیادەرمانی ساڵانێکە دەستی داوەتە کۆکردنەوە و نووسینەوەی وردەکاری پزیشکی کوردەواری، تەنانەت خشتە و ڕێنامەی سەرە-کی بۆ لق و بنەواکانی ئەم پزیشکییەی داڕشتووە و لە سەر ڕووپەڕێکی گەورەی خستووە و لە نووسینگەکەیشی چەسپاندوویە و چەشنی بەڵگەیەکی بەنرخ بۆ کورد ئامادە کراوە. خاڵی گرینگ ئەوەیە کە دەبێ ئیدی شارەزایانی ئەم بوارە ڕێک بکەون و بە هاوکاری ئەم حەکیمە مەواد و کەرەستەی ئەم ڕێنامەیە لە کوردەواری کۆ بکەنەوە. خۆشبەختانە کەڵکەڵەی ئەم کارە لە ناوەندی گیادەرمانی شەفا هەیە. کەوابوو کاتی ئەوە گەیشتووە هەموان بە ئەرکی نەتەوایەتی خۆمان بزانین و دەست بکەین بە ڕێکوپێک کردن و ڕێکخستنی لق و پۆی ئەم بوارە پزیشکیە هەتا بەشکوو ڕۆژێک دەسەڵاتی کوردی یان دەسەڵاتدارانی ناوەندی لە پارچەکانی کوردستان ڕێکەوتنامەی تۆمار کردنی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بخەنە گەڕ و چەشنی ئەرکێکی نیشتمانی مایەی بۆ دابنێن. هیوادارم ناوەندی شەفا ـ کە ئێستاکە بووەتە ڕچەشکێن و پێشەنگی ئەم کارە ـ هەڵێکی تایبەت بۆ کاک بورهان و هاوکارانی «تاد[1]» تەرخان بکات و ڕێخۆشکەری بکات لەگەڵ وزارەتی تەندرووستی ئێران و حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان و لایەنە پێوەندیدارەکانی دیکە، هەتا ئیدی ئەم سامانە نیشتمانییە مەترسی لەبیرچوونەوە و فەوتانی لە ئارادا نەبێت.)

کەوابوو هەر جۆرە ڕەخنە و پێشنیار و هاریکاری کە بۆ ڕاستکردنەوە، هەموار کردنەوە، نووسینەوە، پاشکۆ و زەنگینی ئەم پەرتووکە لە تێبینییەکانی سەرەوە یان بابەتی دیکە دەکەوێتە بیر و بەرچاوی خوێنەرانی هێژا بینێرن. هەموو خاڵ و دەقی ئێوە لە سەر چاو دادەنێم و ڕەچاویان دەکەم، هەروەها لە چاپەکانی داهاتووشدا ناوی بەڕێزتان ـ بە یادگاریش بێت ـ لە کتێبەکە دەهێنمەوە.

**چەند تێبینی گرینگ**

- ئەم فەرهەنگە بەرهەمێکی پسپۆڕی ڕووەکناسییە. جیا لە دەقە بنەڕەتیەکەی کە بە زمانی کوردییە، نێوی ڕووەکەکانیش بە زمانەکانی کوردی، فارسی، ئینگلیزی، عەرەبی و لاتین (زانستی) هاتووە.
- تا ئەو جێگایە خەزێنەی فەرهەنگە گشتی و زانستیەکانی کوردی لەتەک دیاری ناو پرێسکەی گەڕیان و توێژینەوەکانم توانیویانە نێوی کوردی گیاکان لە هەموو زاراوەکانی چوار بەشی کوردەواری هەڵبگرن، لەم فەرهەنگەدا ئاخنراون و تەنیا چاو لە سەر زاراوە یان ناوچەیێک زەق نەکراوە.
- بە بۆنەی فرەزاراوەیی کوردەواری و جۆراجۆری کوێستان و گەرمێنی بەرفراوان، بۆ هەر ڕووەکێ لە هەر ناوچە و زاراوەیێک ناوێک تەرخان کراوە. بۆ نموونە گیای بۆژانە

---

[1]. تولید و آموزش و درمان: بەرهەم و فێرکاری و هەتوان

نێزیک بە ٣٠ نێوی کوردی بۆ بینراوەتەوە. لێرە سەروشەیەکی کوردی کە بە ناوی لێمای سەرەکی هەڵبژێردراوە و هەموو هەمبەرەکانی‌تر لە بەرامیەریدا ڕیز کراون. بۆ ئەم بەشە چەند تێبینی گرینگ ڕەچاو بووە:

یەکەم: نێوێک کە بە ئاسانی و ڕەوانی بگوترێت و گرفتی بێژە لە زوانی یەکگرتووی کوردی نەهێنێتە ئاراوە

دووهەم:هەندێ ناسراوی و نووسراوەیی لە بەش و ناوچەیکی پان و گەورەی کوردەواریدا هەبوویێت

سێهەم: سەروشەکان تێکەلاوی و نارێکی لە ناو زاراوەیکی‌تری کوردی چێ نەکات و وەها نەبێت بۆ ڕوەکێ یان چەند ڕوەکی‌تر بەکار بێن.

- بۆ دیتنەوەی هەمبەرەکان لە زوانەکانی‌تر بەتایبەت ناوی لاتین، لە سەرەکی‌ترین ژێدەر کەڵک وەرگیراوە.
- مەرجی سەرەکی لە هێنانی نەژاد یان جۆرەکان، شینبوونی ڕوەکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان (پارێزگاکانی سنە، ورمێ (ئەو شارانە کوردن یان دانشتووی یەکەم یان دووهەمیان کوردن: سەردەشت، خانێ، شنۆ، نەغەدە، مەهاباد، بۆکان، ورمێ، تیکاب، شاهیندژ، خوی، ماکۆ، سەڵماس)، کرماشان و ئیلام، هەروەها شاری لەکشنینی کوودەشت لە لوڕستان، شاری لەکنشینی ئەسەداوا لە هەمەدان،)، عێراق (پارێزگاکانی سلێمانی، کەرکووک، دهۆک، هەولێر، خانەقین و بەشی کوردنشینی مووسڵ: شەنگال، زوممار، سنوون، قەیرەوان و هتد)، تورکیە (پارێزگاکانی قارس، ئەرزەڕۆم، ئەرزەنجان، سیواس، دەرسیم، قەرەکۆسە، وان، مووش، بینگۆل، ئەلازیغ، مەلاتیە، مەرعەش، گازی ئانتەپ، ئەسکەندەرۆنس، ئورفە، ئادیەمەن، دیاربەکر، ماردین، سیرت، بدلیس و هەکاری) و سووریە (شارەکانی حەسەکە، سەرووکانێ، حەڵەب، تەلتەمەر، کۆبانێ، بەلوونە، عفرین، حەساویەقانی و قامیشلۆ).
- هێندێ ڕوەک کە سەردەمانێکە لە فەرهەنگ و بازاڕی کوردەواریدا وەک بەرهەمێکی خواردەمەنی، بازرگانی، دەرمانی و هتد بەکار دەچێت، لێرەدا ڕواوگەی بۆ نەهاتووە و تەنیا مۆرکی وشەکەی کە بۆ زوانی کوردییە ڕەچاو کراوە، وەکوو: مۆز، دارچین، نارگیل، زەنجەفیل، ئەنبە، وانیل، کافوور، دارئاوەنووس و هتد.
- بۆ دیتنەوەی بەڵگە و گوزارشتی ڕوەکناسی ڕوەکەکان، گەلێک پەڕە و قوژبنی نامە و نووسراوم پشکنیوە هەتا ناوی جۆرێکی ڕوەک بە کارەکەم پتر بکەم و پێرست و هەژماری ڕوەکەکانی کوردستان پتر بین. ئەگەرچی بەناچاری بۆ ئەم بەشە، لە فەرهەنگە گشتیە-کانیش کەڵکم وەرگرتووە، وەکوو فەرهەنگی گیو. ئەم سەرچاوەیە بەڵگەی ڕەسەنایەتی وشەکەی بە ناوی هۆز، زاراوە و ناوچەکەی هێناوە، وەکوو ناوچەکانی زاراوەی زازا لە باکووری کوردستان (سندووس، دێرسیم، خەرپووت، سیوەرەک، ئادیەمەن، باکووری دیاربەکر و ئەرزنجان) یان دەڤەری ڕەواندز لە باشووری کوردستان (چۆمان، خەلیفان و

ڕەواندز). هەروەها گیو لە چەند جێگە ئاماژەی پێ کردووە کە گەواهی کوردی بوونی گە-
لێک ڕوەک لە ڕۆژاوای کوردستان، مامۆستا جگەرخوێنە کە بەشێکی زۆر لە گژوگیای ئەو
بەشەی کوردستانی لەو فەرهەنگەدا ئاخنیوە. لاپەڕەی ١٤ی پەرتووکی شەرەفنامەیش
شوێنی ڕوانی شابەڕووی ناوچەی خێزان و ئەسعەرد لە دیاربەکر هێناوە کە ئەمەیشم چە-
شنی نموونەیکی گوزارشتی ڕواوگە داناوە.

- هەندێ لە سەرچاوە و گوزارشتەکانی ئێرانی و فلۆرەکان بۆ ڕواوگەی جۆرەکانی ڕوەک بە شێوەی گشتی وەکی باکووری عێراق، ڕۆژهەلاتی تورکیە، بەرزاییەکانی شاهۆ، کێلگەکانی تووەفەرەنگی ڕۆژاوای ئێران و هتد ئاماژەیان پێ کردووە. لێرەدا ئەم وێراییەم بە خۆ داوە و بە پالپشتی هەندێ لێزانی و ئەزموون و ڕوونکردنەوەی ژیدەر و توێژینەوەی‌تر، گوزارشتەکەم بەم شێوەیە هێناوە: باکووری عێراق (وەکی بەشی باشووری کوردستان)، ڕۆژهەلاتی تورکیە (وەکی بەشی باکووری کوردستان)، کێلگەکانی تووەفەرەنگی ڕۆژاوای ئێران (مەریوان، سەولاوا، کامیاران، سنە و هەورامان: زۆرترین تووەفەرەنگی ئێران لە پارێزگای کوردستانی ئێران بەرهەم دێت.
- هەژمارێک لە جۆرەکانی ڕوەک لە زوانی فارسی -کە ڕوەکناسانی ئێران یەکەم جار لە کوردستان گوزارشتیان کردووە- بە ناوی شار، ناوچە یان پێناسەیکی کوردستانی ناونراوە. بۆیە ئەگەر گوزارشتی ڕواوگەیشم بۆ نەدیبێتەوە وەکوو جۆری ڕوەکی کوردەواری هێناومن. وەکوو ئەسپۆنی کرماشانی، مێخەکی ئیلامی، براپوونگەی کرێندی، بەڕەزای تاقەوسانی، بایەمە ڕەواندزی، پشیلۆکەی ئەرزەڕۆمی، پووشەنەرمەی کوردستانی، مێوەخۆرکەی کوردی، هالیکۆکی تەرگەوەڕی، هێرۆی هەولێری و هتد.

لە کۆتاییدا سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی هەموو دۆستان و برادەرانم دەکەم و سەری ڕێزیان بۆ دائەنەوێنم کە بە تاقە وشەیەک تا وانە و وێنەی گیایەک دەستیان گرتم. بۆیە بە ئەرکی سەرشانی دەزانم ئەو کەسانەی کە زۆرتر یارمەتی پسپۆڕی، ڕوونکردنەوە و هونەریان بەخشیوە بە ناوهێنانێک کەمترین وەرامیان بدەمەوە. کاک: ماجد مەردۆخ ڕۆحانی (سنە)، مەحیەدین کەریمیان (سەقز)، بورهان و موحەمەد حەسیب حوسەینی (گیادەرمانی شەفا: سنە)، کەماڵ ڕەحمانی (خانێ)، موحسێن ساڵحی (بانە)، ئیسماعیل ئیبراهیمی (قووچان)، ئەبووزەر ئیسماعیلی (شیراز)، ئیبراهیم ئیمانی فیرووزابادی (ڕەشت)، مەحیەدین ڕەسووڵیان (ڕەبەت)، قاسم عەبدالی (ئیلام)، حوسێن مەعرووفی (سنە)، دکتۆر ئازاد ڕەستگار (ڕوەکناس: مەریوان)، سادق ئەبولموحەمەدی (سەقز)، یەدوڵا پەشابادی (کامیەران)، وریا دیوانی (سنە)، حەسەن موحەمەدی (مەریوان)، ئەفشین بەهاریزەڕ (سنە)، ئیسماعیل ڕەوانگەرد (مەریوان)، خانم کەریمپوور (کارناسی ڕوەکناسی تاقیگەی زانکۆی بیرجەند)، خانم شاهبەیگی (بەرپرسی کتێبخانەی زانکۆی کشتوکالی بیرجەند)، دکتۆر سامان ئەفراسیاب (ڕوەکناس:

زانكۆی كشتوكاڵی سلێمانی/ بەكرەجۆ)، حەبیب و موحەممەد كەریمی (ڕوانسەر)، كارمەندانی كتێبخانەی بنكەی توێژینەوەكانی كشتوكاڵی و ژینگەی سنە، ئەندامانی كۆمەڵەی ڕووەكناسی لە سلێمانی (جەلال سەید كەریم گەڕاوی، ئیسماعیل خەلیفە سابیر و قەیوم عەبدولكەریم هەورامی)، ئەندازیار سەیفەدین هەورامی (فەرمانگەی كشتوكاڵی خورماڵ)، ئەمین تاهێری (بیجاڕ) و دادە گولاڵەی بەهرامی (سنە). بەو هیوایە خواگیان ئەم كارە بە پاكی و ماكی لێمان وەربگرێ و چەشنی جۆگەلەیكی ئاژین بە كوردەواریدا بگەڕێ و ئاوێكی هەرمان بێ بۆ تینوانی بوارەكانی ژینگە، كشتوكاڵ، سروشت پەروەری و گیادەرمانی.

تكایە لە دۆعای خێرتان بێبەریمان مەكەن. هیوادارم ئەم شەقاوە شیاوە شایستەی ئەوە بێت چەشنی باقیات الصالحاتی دوارۆژمان چاوەنواڕی بكەین.

"فەزای دڵ وێنەی هەوای كوردستـــــان — خەوش كا ڕەحمەت و بەرەكەت بـــاران
بۆ هـــــەزار لاوێن لە زاڵــــم بەســـام — پێغــــەمبەری خوا سەڵەوات و ســــەلام"

خزمەتكاری سروشتی كوردەواری
ئیرەج مورادی
٦ی ڕەشەمەی ٢٧١١ كوردی (١٣٩٠ هـ.) ـ گوندی باقلاوا
(بە هەندێ زیاد كردن و ڕاستكردنەوە ـ ١٢/٣/٩٣ـ سلێمانی)

**ناونیشانی وەرگرتنی پەیام و نامەی خوێنەران (بۆ ڕەخنە، پێشنیار، زانیاری، زیادكردن، هەڵەگری، ڕاستكردنەوە و تێبینی):**

- ئیمەیل: komasy٢٧٠٦@Gmail.com
- پەڕەی فەیسبووك: www.facebook.com/Iraj Moradi
- سنە، ناوچەی كەلاتەرزان، پشتی بەنداوی"ئازاد"ی كوردستان، گوندی باقلاوا، كۆدی پۆستی ٣١٣٥١-٦٦٧٦١
- شاری سنە، شەقامی شوهەدا (فەراح)، تەپەی ئەولیابەگ، پلاك ٥٧، كۆدی پۆستی ٤٧٣٥٣- ٦٦١٤٨
- شاری سنە، دەور مەیدان، بەرانبەر مزگەوتی داروغە، ناوەندی گیادەرمانی شەفای كوردستان، نووسینگەی تیمی"تاد"
- سەردەشت، ڕەبەت، شەقامی خۆمارۆ، تەنیشت مزگەوتی ڕەبەتی خواروو، كۆدی پۆستی ١٥٩٥٥-٥٩٦٩١

به نێوی پەروردگاری بێ‌گیان و گیا و گیانلەبەر و ئینسان

**پزیشکی خۆماڵی کوردەواری (KTM: KurdishTradishnal Medicine)**

یەکێ لە ئاستە پزیشکیەکانی مرۆڤ هەمان پزیشکی خۆماڵی کوردەواریە کە سەرچاوەی لە ناو ژیان و شارستانیەتی خەڵکی کوردستانا بەرچاو ئەکەوێ. ئەم ئاستە پزیشکیە وەکوو پزیشکی هەموو گەلانی مێژووداری جیهان باوە و بەکار ئەچێت.

تایبەتمەندیەکانی یەکجار زۆرە بەلام بەداخەوە نووسراوەی ئێجگار کەمە. چونکە سین-بەسین لە پێشینیانەوە هاتووە و گەیوەتە بەرەکانی دواتر. هەمیشە زۆرتر لە ناو چینی دێنشین و خەڵکی ئاساییدا پەروەردە بووە و بۆیە ئاوێتەی ژیانی خەڵکی لادێ و شوان و پیرەژنان و پیرەپیاوان بووە. بەگشتی ئەگەر گەرەکمان بێ گشت سەرچاوە و لقەکانی بدۆزینەوە ئەشێ بچینە گوندەکان و لای خەڵکی بەئەزموون و پسپۆڕی گوندنشین پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بناسین و شارەزایی لێ بەدەس بێرین.

برای خوێنشیرینم کاک ئیرەجی موراد‌ی نووسەری ئەم پەرتووکە جوان و کەم‌وێنەیە (فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستان) ئاماژەیەکی کورتی بە ڕابردووی گیادەرمانی و پزیشکی و گیاناسی لە کوردستانا داوە و کەمێک لە بوار و گۆشەکانی پلەی دەرمانگەری و پێوەندی خەڵکی کورد لەتەک سروشتدا بەتایبەت گیادەرمانی باس کردووە. هیوادارم بەرا پێشەکی ئەم کتێبە بەنرخە بخوێننەوە هەتا باشتر کەڵک لەم کتێبە وەرگرن.

بە گوێرەی دەسهاتەکانی چەن ساڵەی ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان ـکە بنکەی سەرەکیی لە ناوەندی شاری سنەیە و خاوەنی دەیان بریکار و نوێنەرە لە کوردستان و بڕێ لە شارەکانی ئێران- پزیشکی خۆماڵی کوردەواری خاوەنی ناوەرۆک و گەلێک بنەمای پتەوە کە

ئێمە زۆرتر لە سی ساڵە کاری کۆکردنەوە و توێژینەوەی لە سەر ئەکەین. بۆ نموونە بۆمان دەرکەوتووە کە نزیک بە ٣٠٪ بنەماکانی ئەم پزیشکیە سوود وەرگرتنە لە ڕوەک و بەرهەمە ڕوەکیەکان، هەروەها ٧٠٪ پاشماوەی سەر بە بابەتەکانی دیکەیە وەکوو بەرهەمە ئاژەڵیەکان، کانزاکان، ئاو، خاک و هتد. بۆیە ئێمە لە ماوەی تێکۆشانی ٣٠ ساڵەماندا هەوڵی زۆرمان خستوەتە سەر کۆکردنەوەی ناو و بەرهەمە ڕوەکیەکانی کوردەواری. جێی خۆشحاڵیە لەم ساڵانەی دواییەدا ئەژمارێک کتێو و سەرچاوەی پێوەندیدار بە پزیشکی و فەرهەنگی گیادەرمانی و گیاناسی کوردەواری هاتوونەتە بازاڕ کە یەکێ لە بەنرخترینی ئەو کتێبانە ئەم کتێبەی فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستانە.

ئێستاکە لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا گرنگی و بەهایەکی تایبەتی ئەدرێت بە پزیشکی خۆماڵیان کە ئەنجامی ئەزموونی سەدان و هەزاران ساڵەی پێشینانیانە. ساڵی ٢٠٠٢ "ڕێکخراوەی نێو نەتەوەیی تەندروستی" (WHO) ڕێنامەی سەرەکی ساڵی تەرخان کردبوو بە گرنگی پێدان بە پزیشکی خۆماڵی هەموو گەلانی گەورە و بچووکی دنیا. یەکێ لە بڕگەکانی ئەم ڕێنامەیە؛ ڕێنوێنی کردنی هەموو خەڵک بەتایبەت دەسەڵاتداران و خاوەن حکوومەتان بوو بەرامبەر پزیشکی خۆماڵی و پێشینیانیان. بۆیە پێویستە فریای هەڵگرتن و پاراستنی ئەزموونی پێشینیان بکەوین و نابێت پزیشکی سەردەم هەموو ئاستە پزیشکیەکانی دیکە وەکوو گیادەرمانی، پزیشکی پارێز، ئاودەرمانی و هتد لە ناو ببات.

هەر وەک کاک ئیرەجی بەڕێز باسی کردووە: شوکر بۆ پەروردگار ولاتی کوردەواری لە ڕوەکە دەرمانیەکاندا ئێجگار دەوڵەمەندە و دەتوانین سوودی زۆریان لێ وەرگرین بۆ دەرمان و چارەسەری ئازار و نەخۆشیەکانمان. ئومێدم هەیە ئەم کتێبە بە ئێوەی هێژا یارمەتی بدات کە لە ڕێگای دەرمانی گیایی و ناسینی بەرهەمەکانی کشتوکاڵی و سروشتی هەنگاوێکی باش هەڵێنین و وەرامێکی شیاو ئاراستەی ڕێکخراوەی تەندروستی جیهانی بکەین.

ئازیزان سی ساڵ لەمەو پێش لە ئامریکا پزیشکی "دەرزیئاژنین: "سوزنی"چینی، وەکوو کارێکی دڕندایەتی باسیان دەکرد. کەچی بە پێی گوزارشتی ڕێکخراوەی ناونەتەوەیی تەنەروستی ساڵی ٢٠٠٢، پزیشکی دەرزیئاژنین لە ٣٩ ئەیالەتی ئامریکا بە فەرمی ناسراوە و لە ٩ ئەیالەتی دیکە خەریکە دەناسرێ. دیارە تا ئێستا ـ٢٠١٣ـ لە هەموو شوێنی ئەو ولاتە پێشکەوتووە بە فەرمی ناسراوە؛ کەچی لێپرسراوان و پزیشکانی ولاتانی ئێمە کە باسی پێشکەوتوویش دەکەن، ئاوەها لە گەڕانەوە بۆ پزیشکیە خۆماڵیەکان وەکوو پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بە دواکەوتوویی دەزانن!! بۆچی؟! بۆیە!!...

جا بەڕێزان ئەوەی ئێمە لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری دیومانە؛ گەلێک نەخۆشی جۆراوجۆری دنیای ئەمڕۆی بە ئاسانی چارەسەر کردووە. کەوابوو ڕەوا نییە ئێمە لە گەنجینەی کۆن و بەنرخی خۆمان بێگانە بین و بۆ هەموو دەرد و دەرمانێک دەس بە داوێنی ولاتانیتر بین. لە کاتێکدا کە بۆ زیاتر لە ٥٠٪ نەخۆشینەکانی خۆمان ئەتوانین لەم پزیشکیە کەڵک وەربگرین؛ کە دیارە چەندە کار و پیشەی باش بۆ ڕۆڵەکانی خۆمان ساز دەکەین و چەندە لە چوونی پارەی گەلەکەمان بۆ دەرەوە بەرگری ئەکەین و چەندە دەتوانین گەشتیار و خوازیارانی تەندروستی بهێنینە ناو وڵاتەکەمان.

جێی شانازیە کە بێژین: "شەفای کوردستان" ماوەی بیست ساڵ پێش لەو ڕێنامەیە هەموو ئەو ئامانج و مەبەستانەی لە پێش گرتووە و هەزاران بەڵگەی بۆ ئەم بابەتەی هەیە. ئەمەش بە ودمی کەڵەپیاوان و شێرەژنانی کوردەواری بوو، وە بە لوتفی خودا کە تەوفیقی داین لە پەنای شاهۆی سەربەرزو سەرسەوزەوە لە پیرە بە ئەزموونەکانمان شتی زۆر وەرگرین و بە خەڵکەکەمانی خەڵات کەین.

## کام ڕوەک، ئەبێ دەرمانی بێ؟

ڕوەکە دەرمانیەکان لە بنەڕەتدا دوو دەستەن:

١ـ ئەوەی لە مێژووی گەلاندا ناسراوە و لە سەر زاری خەڵک و لە نێو پەرتووکە کۆن و نوێیەکاندا نووسراون.

٢ـ ئەوەی کە بە شێوازی زانستی و تاقیگەیی کاری لە سەر کراوە و دوای ڕونێسانسی ئورووپا بەم لاوە ـورده ورده ـ گەشەی سەندووە.

**دەستەی یەکەم:** لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا هاتووە و زۆر ئەزموون و کاری لە سەر کراوە: زەکریای ڕازی، ئەبووعەلی سینا و دینەوەری لە پێشکەوتوانی ئەم دەستەن؛ کە ئەڵبەت لە دیسکۆرید و بوقرات و جالینووس و کەڵەپیاوانی یۆنانی کۆن و دیکە کەڵکی زۆریان وەرگرتووە. سەدان بەڵکوو هەزاران ـ پەرتووکی بەنرخ لە زانایانی سەردەمی دەستەلاتی موسوڵمانان بەجێ ماوە، کە لە بواری ڕوەکناسیدا لە هەمووان شارەزاتر ئیبنەبەیتارە. کەسێکە سێ قورنەی ئەفریقا و ئاسیا و ئورووپای ئەو سەردەمە گەڕاوە تا کتێبی "جامعی ابن بیطار" نووسیوە واتا نزیکەی ١٦٠٠ ڕوەکی دەرمانی بە وردی ناساندووە و بەڕاس کەڵەپیاوی ڕوەکناسی دەستەی یەکەمە. هەروەها باشترە بزانین کە ئەم زانایە لە زۆر جێگەی کتێبەکەیدا ناوی بلیمەتی کوردستان **ئەبووحەنیفەی دینەوەری**. دەبا و زۆرێک شەڕ و هەرای گیاناسانی

به وردبینیه جوانەکانی دینەوەریڕاستکردۆتەوە. کاک ئیرەج لە پێشەکیدا باسی دینەوەری کردووە و بەداخەوە لە کۆی پێنج بەرگی بەرهەمی دینەوەری تەنیا یەک پێنجەمی ماوە و ئەویش پاش گەڕانێکی زۆرمان بە وڵاتاندا ئاخری بەهۆی کابرایەکی سووریەیی بەدەستمان هێنا و ئێستا کە کتێبخانەی شەفای کوردستانە.

**دەستەی دووهەم،** لە زانای پایەبەرزی ئورووپا بە ناوی **"لینە"**وە دەستی پێ کردووە کە زۆربەی زانکۆکان لەم شێوازە زانستیە پەیرەوی دەکەن. باشی ئەم شێوە لەمەدایە کە هەر روەکێ بۆ یەکەمجار و لە هەر کوێ ناسرا، بۆ هەموو گەلان هەر ئەوەیە و ئیتر جێی گێرە و کێشە نییە. بەلام لە دەستەی هەوەڵدا وا نییە.

باشی دەستەی ئەوەڵ ئەمەیە کە ئەزموونی زۆر و زەبەنەی هەموو گەلانی لەسەرە. کەوابوو زۆر حەیفە بایەخی باشی پێ نەدرێ، بەلام ئەگەر لە نێوان هەر دوو دەستەکەدا ئاشتی زانستی بکرێ، نە تەنیا لە خەیر و بەهرەی هەردووکیان بەشدار ئەبین بەڵکوو ناتەواوی هەرکامیشیان قەرەبوو ئەکەینەوە. ئەگەر بە جوانی سەرنجی ئەو رێکارەی ٢٠٠٢ رێکخراوەی نێونەتەوەیی تەندروستی بدەین، ئەبینین بەشی گرینگی ئامانجی هەر ئەمەیە. بەلام داخەکەم، وزارەتی تەندروستی لە زۆربەی ولاتانی خۆماندا هەمیشە زۆر دواکەوتوون لەو هەڕەشە جیهانیانە، کە:"خەڵکینە ئەگەر ئاگاتان نەبێ و بە جوانی و بە کات و جێی خۆی نەجووڵێنەوە، پزیشکی خۆماڵیتان لەم دنیای بازرگانی و هێرشی بەستەبەندی خۆراکیە جۆراوجۆرانەوە فەوتاوە. بەداخەوە بۆ گەلی خۆمان و ئەو گەلانە کە نوسراوەیان نییە یان کەمە، بە مردنی هەر پیرێک بەڕاس کتێبێکی تایبەتی ئەچێتە ژێر خاکەوە و بۆ هەتاهەتایە دەفەوتێت. کەوابوو ئەرکی سەرشانی هەموومانە: هەموو ئەزموونەکان و قسە کۆنەکانی باپیر و دایەپیرانمان تۆمار کەین و بە هەر بەهانەیکەوە بێ قسە و باسیان بێنین. با لێشیان تێنەگەین یان باسەکانیان بەکەڵک نەزانین، هەر بینووسین و بە هەر شێوەیێک تۆماری کەین. متمانەتان هەبێ شەفای کوردستان لە ماوەی سی ساڵدا، بەم شتانەوە بوو بە "شەفا"! کە ئێستا سەدان نەخۆشینی سەیروسەمەرە چارەسەر دەکا و بە سەدان هەزار کەس لە داودەرمانی کوردەواری لە شاری سنە و شوێنەکانی‌تر کەڵکیان وەر ئەگرن. جا بڕوای من ئەوەیە: رێژەی ٥٪ لەم پزیشکییە کۆن و گەورەیەمان هێشتا بە کار نەهێناوە. بۆیە پێویستە گشتمان بکۆشین هەمووی ئەم سامانە کوردیە پەروەردە بکەین با گەشە بستێنێ و لە خزمەت خۆمان و خەڵکانی دیکەیشدا بێ. ئومێدم هەیە ئەم کورتە باسە بۆ ئێوەی هێژا بەس بێ.

## ڕازی هەزار ساڵەی قانوونی هەژار

ئەبووعەلی سینای فارس زمان، هەزار ساڵە پێش قانوونی بە زمانی عەرەبی نووسیوە؛ جا بەم هەمووە زوانەوان و وەرگێڕە گەورانە لە زانکۆکانی ئێران، نەیانتوانی قانوون بە زمانی خۆیان وەرگێڕنەوە. کەچی هەژارێک لە کوردەواری ئەم چاچۆڵەی شکاند. ئەوە چۆن؟

بیس و چەن ساڵ لەمەوپێش لە تاران کۆبوونەوەیەکی نێونەتەوەیی سەبارەت بە مێژووی پزیشکی ئیسلام و ئێران لە زانکۆی تاران ساز کرابوو. بڕیار بوو لە موسکۆ بەڕێوە بچێت بەڵام بەهۆی هەڵوەشانەوەی کۆمارەکانی شەورەوی خستیانە تاران. هەر بەم بۆنەوە زۆر گرنگ بەڕێوەیان برد. لە سالۆنی نمایشدا دەیان نوسخەی ناتەواوی وەرگێڕاوی قانوونیان دانابوو. هەموویان بۆ زۆرێک لە وشە و دەستەواژە و زاراوەکان شتێکیان دەس نەکەوتبوو. بەم هۆیەوە کە لە زۆرێ لەو دەستەواژە و وشانە تێ نەگەیشتبوون. بۆچی؟ بۆ ئەوە ئەو وشانە کوردی بوون و ئیبنیسینا، کەموکۆڕیەکانی زمانی عەرەبی و فارسی و یۆنانی ئەو سەردەمەی، بەم زمانە دەوڵەمەندە پڕ کردبۆوە. (ئاخر ئیبنی سینا لە هەمەدان دەژیا و لەگەڵ زانایانی کوردەواری ئەو سەردەمەدا هاتوچووی بووە) دیارە: هەزار ساڵ لەمەوپێش چەندە فەرهەنگی داودەرمانی کوردەواری، تەژی و دارا و دەوڵەمەند بووە.

کەوابوو وەرامی ئەم پرسیارە بە ڕوونی دەردەکەوێ کە: وەرگێڕی قانوونپێویستە زانای سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی بێ تا دەرەقەتی ئەم پەرتووکە هەرە بەنرخە بێ. مامۆستای نەمر هەژاری هێژا و بلیمەت بۆ خۆی باسی ئەم وەرگێڕانە دەکا و کاک ئیرەجیش لە سەرەتای فەرهەنگەکەیدا ئاماژەی پێ کردووە. کەوابوو وەرن: با نەختاڵێ جوانتر و وردتر سرنجەی ئەو فەرهەنگە دارا و هەژارەی خۆمان بدەین (دارا لە پێشینیانەوە و هەژار بە دەستی ئێمەی نووسەر و کاربەدەست و دەستەڵاتداری ئەم دنیای تەلەفوون و ئینتەرنێت و کامێرا و ماهوارە و شتومەکی جۆراوجۆری تۆمارکردن و هتد).

## کێشەی ناوی جۆراوجۆری ڕوەکەکان

وەک دەزانن هەموو ولاتێ وشەی تایبەتی خۆی هەیە. گەلانی ڕابردوو لە سەردەمی پشکوتوویی ئیسلامدا لە میسرەوە تا چین، لە ڕۆمەوە تا هێندووستان، لە یەمەن و سوودانەوە تا گورجستان و ئازەربایجان، لە ئەندلوسەوە (واتە: ئیسپانیای ئەمڕۆ) تا ڕۆژهەلاتی دوور ـ کە سەدان زمان و زاراوەی تێدا بوون ـ هەموویان بە زمانی یەکگرتووی عەرەبی، کە

ئازربایجانی ٢. ناویکی‌تری گیای سیفۆکە ٣. ناوی جۆری (*Salvia sclarea*)ی گوڵە پووران ٤. ناوی ڕووەکێکە گوڵی سپی چەشنی شادانەی هەیە و گەڵاکانی بۆ سارێژی سەر برینان دەبێ ٥. ناوی‌تری گیای پەمگ لە جنسی گیای گێنوو

رواوگە: ١. گوندی ویسەر، ڕەشنەش، کەرجۆ، کورە میانە، هەشەمێز، ئارێز، ڕێگەی سنە بۆ کەرەسی و سەربناو، ڕێگەی کەڵەکان بۆ بست، کەل سەڵواتاوا، تەکیە، شیان لای سنە و کوێستانی نەکەرۆز، پیرعومەران، ناوچەی سەرشیو، ڕێگەی سەقز بۆ بانە، کوێستانی عەوالان، زۆنج، باقلاوای شێخ حسەین، کۆڵ، دزێڵە، بنیەر، پیرخیران، کوێستانی قەڵەبەرد، خواشت، ناوچەی سەرشیو، بلچەسوور، دگاگا، مازیبن، چەم دەرەزنجیر، سڵتان ئەحمەو لای مەریوان، بەورویەریشان لای قوروە، تەنگی‌سەر لای کامیاران، ڕوانسەر، پاوە، جوانڕۆ، سەردەشت، میراوێ، شنۆ و مەهاباد ٤. کوێستانی کۆسالان و هتد (٩کو)

**کوفکارک**

راڤە: ناوی کارگێکە بە فارسی (قارچ دشتی)

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**کولافک** ☜ قارچک

**کولالاش** ☜ کلولاش

**کولکنک**

راڤە: ناوی ڕووەکێکی کولکاوییە و بۆ دەرمانە

رواوگە: لای کرماشان (٩کو)

**کولیکبووک**: کولیک‌پاقژە

راڤە: ناوی ڕووەکێکە وەسە گووژالک، گوڵی سوورە، لاسکی گوڵەکانی زۆر درێژن و خاڵی ڕەشی پێوەیە و لە ناوەڕاستی گوڵەکاندا زەردە

رواوگە: باکووری کوردستان (٢٠و)

**کولیک‌پاقژە** ☜ کولیکبووک

**کولیک‌جوانەمەرگ**

راڤە: ناوی ڕووەکێکی وەرزی پاییزە، گوڵێکی سپی هەیە و بنی سەلکدارە؛ دوو ڕووەکی‌تر هەیە بەم وشەوە نزیکن، گیای جانی مەرگ و جوانە مەرگ؛ ژێدەری سەدرەدین جوانەمەرگی بە گیای پیشۆک هێناوە

رواوگە: کوردستان (٢٠و)

**کولیل‌هرچ**

راڤە: ناوی ڕووەکێکە لە مانگی نیساندا شین دەبێ، مانگی گوڵان گوڵ ئەدا، هەتا ٢٠ سانتیمتر بەرز دەبێ و ڕەنگی گوڵی سوور و بەنەوشن

رواوگە: باشووری کوردستان و ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەلماس (٣/٢کو)

**کولکینە**

راڤە: ناوی ڕووەکێکە

رواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩کو)

**کولولاس**

راڤە: ناوی ڕووەکێکە

رواوگە: گوندی کۆلەسارەی لای سنە (٩کو)

**کومبەلۆک** ☜ قارچک

**کومکی‌شقان**

راڤە: ناوی ڕووەکێکی دەشتیە

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**کونجی دەیمی**: کونجی‌کێوی، کونجی‌کێفی، کونجی‌کێویلە، کونجی‌کەرک، کونجی‌خۆڕسک

راڤە: ١. ناوی ڕووەکێکە بە فارسی (کنجد خودرو، کنجد وحشی، کنجد کوهی) دەبێت ٢. ناوی ڕووەکێکە بە ڕوالەت چەشنی گیای کونجیە بەلام جۆرێکی گیای گوڵە ڕەبەنۆکە، ژێدەری خزری نووسیویەسی لە جۆری گوڵەڕەنۆکی مانتیایە (وێدەچێ مەبەستی بووە مانتیا، جۆرێکی جنسی گوڵە ڕەبەنۆکە) بەلام موزەفەریان وەها جۆرێکی نەهێناوە، کەوابوو کونجی دەیمی لە جۆرەکانی گوڵە ڕەبەنۆکە

**رواوگـە:** ١. کوردسـتان (١٣و)؛ وەکـی گونـدی مەڵەکشانی سنە، ناوچەی سەرشیو و گوندی نێ مەریوان (٤٩و)

**کونجی خۆڕسک** ☜ کونجیدەیمی

**کونجیکێفی** ☜ کونجیدەیمی

**کونجیکێوی** ☜ کونجیدەیمی

**کونجیکێویلە** ☜ کونجیدەیمی

**کونجیکەرک** ☜ کونجیدەیمی

**کونجیلە**

**راڤە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١و)

**کوندکێ کۆسە:** کوولەکەی دۆڵمە

**راڤـە:** نـاوی جـۆرێ کوولـەکـە بـە فارسـی (کـدو دُلمه)یە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کوێزرک**

**راڤە:** ناوی روەکێکی بەهاری و کێویە، لە سەر بنی پار شین دەبێ، بۆ ژانی گەدە دەرمانە، لە ئاوی هەنارا لێینیت و شەربەتی لێ ساز کەیت خواردنی بر وریایی زۆر باشە

**رواوگـە:** باشـووری کوردسـتان و ورمـێ، مـاکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەڵماس (٣/٥٤و)

**کۆخەتووکنە:** هەشتاڵوو پاییزە

**راڤـە:** نـاوی جـۆرێ کۆخـە، رەنگـی پێسـت و گۆشتەکەی سپییە، ئەندازەی گچکە و مامناوەندیە، لە جۆری کۆخی دەندوو نەچەسپاوە و گۆشتەکەی بە ساکاری لە دندووەکە لێدەبێتەوە، لە رەزبەری پـاییزا دەگـات، جـۆری هـەشتاڵـووی خۆمانـە و خۆولاتیـە، کـاتی گـەیشـتنی بـە هاسـانی تووکـە سـپیەکانی توێکڵـەکـەی لادەچێـت، توێکڵـەکـەی خۆشـخۆر نیـە و لـە گۆشـتەکـەی جـوێ دەبێتـەوە، گۆشـتەکـەی بنـەچێـژێ تاڵـی هـەیـە، بـەری زۆر دەگرێ

**رواوگە:** کوردستان (٧٨و)

**کۆخهەنجیری:** هەشتاڵوو هەنجیری

**راڤە:** نـاوی جـۆرێکی هـەشتاڵـووەی ئـەمڕۆیی و تازە بـاوە، شیرین و ئـاودارە، ئـەندازەی گـەورە و پانە، رەنگی گۆشتەکەی هـەندێ سـوورە، دەندوو چەسپاوە، دەندووەکەی زۆر لـە نـاو گۆشـتەکـەی نەشاردراوەتەو، سەرەتای هاوین دەگات (فارسی: هلو انجیری)

**رواوگە:** کوردستان (٧٨و)

**کۆخیسوور**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی هەشتاڵووەی ئەمڕۆییـە کـە زۆر کشـتوکاڵ دەکـرێ، دەنـدوو نـەچـەسـپاوە و چەسپاوی هـەیـە، توێکڵـەکـەی هـەنـدێ تـووکی هەیە و خۆشخۆرە و کەمێ سووری بەرەو سپیە، ئەندازەی گەورە و هێلکەییە، بنەچێژی تاڵی نیە و زۆر ئاودارە، لە سەرەتای هاوین دەگات

**رواوگە:** کوردستان (٧٨و)

**کۆرزیوان**

**راڤە:** ناوی روەکێکە بستێ بڵیند دەبێ، گەڵاکانی لاسکی دائەپۆشن و گەڵای وەسە زوانـی مـالات، تـووکن و تۆزاویـە و گوڵـێکی سـپی و شـین دەر ئەکات و لە نێو گوڵەکانی زیوانی تێدایە

**رواوگە:** کوردستان (٢٠و)

**کۆرەلاش**

**راڤـە:** نـاوی روەکێکـە، وێـدەچێ هـەمـان گیـای کلۆلاش یا کورالاش بێت

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**کۆفرک**

**راڤە:** ناوی روەکێکە لە شیناورد و مێرگا شین دەبێ

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کۆلۆزپانە**

**راڤە:** ناوی روەکێکی بەهاریە، گوڵی زەردە و بە

کولاتەیی بۆ ژانەسک دەشێ
**رواوگە:** ناوچەی هەورامان (هەڵەبجە، باخەکۆن، بیارە، تەوێڵە، کێمنە، نەوسوو، نۆدشە، پاوە، سەولاوا، بێساران، باینگان و چەم ژاوەرۆ) (٢٠و)

**کۆڵۆزبانە**
**راقە:** ناوی روەکێکی بەهاری و دارووییە، گوڵەکانی زەردە، کولاتەکەی بۆ ژانەسک باشە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**کۆڵنجان**
**راقە:** ناوی روەکێکی لای گەرمیانە، هارپاوەی بۆ ڕەقینەی ئەندام دەبێت
**رواوگە:** کوردستان (٨و)

**کۆڵوو**
**راقە:** ناوی روەکێکە
**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩و)

**کۆڵەبی** ☜ بیکۆڵ

**کۆڵەزوانە**
**راقە:** ناوی روەکێکە؛ وێدەچێ هەمان گیای کۆڵۆزبانە بێت
**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**کۆڵەسوور**
**راقە:** ناوی روەکێکە چەشنی ڕیحانەبەرزەیە
**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩و)

**کۆنکۆڵ**
**راقە:** ناوی روەکێکە لە دەستەی داری لێرەواری بەرەکەی چەشنی پەمووە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کۆیە**
**راقە:** ناوی روەکێکە؛ ناوی شارێکی باشووری کوردستان و زێدی هەستیار و کەڵەپیاوی داوێتی کوێستانی هەیبەت سوڵتان، حاجی قادری کۆیی
**رواوگە:** لای هەورامان (٩و)

**کووشک**
**راقە:** ناوی روەکێکە
**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**کوولاڤک** ☜ قارچک

**کوولەکە:** کوولەکە ترشی، کوولەکە ترشیانە، کوولەکە خانمی، کوولەکە خانمانێ، کوولەکە دۆشاویی،کوولەکە دەروێشی، کوولەکە باڵقەباغی، کوولەکە سەنەڵی، کوولەکە بوتڵی، کوولەکە سپی، کوولەکە سوورە، کوولەکە شیرینە، کونەدکێ کۆسە، کوولەکەی دۆڵمە، قاقەڕەش، قاقرەش، فاتەڕەش، لۆراسی، کوولەکە شاقەباغی، کوولەکە ئاوی، دورملک

**کوولەکە ئاوی**
**راقە:** ناوی جۆرێکی کوولەکەی چکۆلەی سپیکەلانە
**رواوگە:** کوردستان (٢٠و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**کوولەکە بارزانی** ☜ کوولەکە شاقەباغی

**کوولەکە باڵقەباغی**
**راقە:** ناوی جۆرێکی گیای کوولەکە، ملدرێژە ناوەکەی دەرتێرتن و شمەکی تێئەکەن
**رواوگە:** کوردستان (٢٠و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**کوولەکە بوتڵی**
**راقە:** ناوی جۆرێکی گیای کوولەکە
**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**کوولەکە ترشی**
**راقە:** ناوی جۆرێکی گیای کوولەکە؛ وێدەچێ هەمان کوولەکە ترشیانە بێت
**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**کوولەکە ترشیانە**
**راقە:** ناوی جۆرێکی گیای کوولەکە
**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که خانمانێ**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که
**رواوگه:** کوردستان (٧٨و)

**کووله‌که خانمی**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که؛ ویده‌چێ هه‌مان کووله‌که خانمانێ بێت
**رواوگه:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که‌دار**
**راڤه:** ناوی روه‌كێكه له جۆری سپیدار، هه‌موو شتێكی چه‌شنی ئه‌سپیداره به‌لام كاتێ هه‌لده‌چێ پڕ له‌ق‌وپۆوه و به كۆمه‌ڵ له بنه‌وه لق ده‌هاوێ؛ له ناوچه‌ی كۆماسی و كه‌لاته‌رزان به تایبه‌ت گوندی زه‌نووری، باقلاوای شێخ‌حسه‌ین و زۆنج جۆرێكی وه‌ها ئه‌سپیدار هه‌یه به‌لام له بنه‌وه وه‌ها له‌ق ناهاوێت، كووله‌كه چناری پێ ئێژن
**رواوگه:** گوندی كانیه‌ڕه‌ش و كانیه‌سپی مه‌هاباد (٧٨و)

**کووله‌که دورملک**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)

**کووله‌که دۆشاویی**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که، جۆرێکی سوور و شیرینی گه‌وره بۆ چێشت ده‌بێ
**رواوگه:** کوردستان (٢٠و)؛ وه‌کی به‌شی باشوور (٦و)

**کووله‌که دۆلمه**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی کووله‌که‌یه که بۆ چێشتی دۆلمه ده‌شێ و به عه‌ره‌بی (القرع الكوسه)یه
**رواوگه:** باشووری کوردستان (١٦و)

**کووله‌که ده‌روێشی**
**راڤه:** ١. ناوی جۆرێکی کووله‌که‌ی بنخڕی مل باریكه، ده‌روێشان ئه‌وسا ڕۆنی سوالیان تێده‌كرد؛ یده‌چێ هه‌مان کووله‌که بالقه‌باغی بێت ٢. ناوی روه‌كێكه له ناو گه‌نما شین ئه‌وێت و به‌رێکی وه‌کوو کووله‌که ده‌روێشی ئه‌گرێت
**رواوگه:** کوردستان (٢٠و؛ ٨و)؛ وه‌کی به‌شی باشوور (٦و)

**کووله‌که زه‌رده**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی کووله‌که‌یه به عه‌ره‌بی (القرع العسلی)ی پێ ئێژن
**رواوگه:** باشووری کوردستان (١٦و)

**کووله‌که‌سپی**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که، ڕۆن و ترمه‌که‌ی بۆکوژتنی کرمی ناوسک چاكه به ئینگلیسی (White gourd) ده‌بێت
**رواوگه:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که‌سووره**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که بۆ ده‌رمان ده‌شێ، به ئینگلیسی (Red gourd) ده‌بێت
**رواوگه:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که سه‌نه‌ڵی**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که، گه‌وره‌ی سه‌رخڕه و قاش‌قاش ده‌کرێ بۆ چێشت
**رواوگه:** کوردستان (٢٠و)؛ وه‌کی به‌شی باشوور (٦و)

**کووله‌که شاقه‌باغی:** کووله‌که بارزانی
**راڤه:** ناوی جۆرێ کووله‌که، ئه‌ندازه‌ی گه‌وره‌یه و ره‌نگی زه‌رد و زه‌ردی به‌ره‌و سووره که چێشت ده‌بێ، هه‌ڵکری هه‌تا به‌هار له ماڵه‌وه ده‌بێ
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)

**کووله‌که شیرینه**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که
**رواوگه:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که فاته‌ڕه‌ش**
**راڤه:** جۆرێ کووله‌که‌ی مه‌یله‌و ره‌شه؛ ویده‌چێ هه‌مان کووله‌که ڤافه‌ڕه‌ش یا کووله‌که قاقڕه‌ش

بێت که له بێژه‌دا گۆڕابێت
**رواوگه:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که قاقه‌ڕه‌ش**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که، وێده‌چێ هه‌مان کووله‌که قاقڕه‌ش بێت
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)؛ وه‌کی به‌شی باکوور له مه‌ڵبه‌ندی زاری زازا (٨و)

**کووله‌که قاقڕه‌ش**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)

**کووله‌که لۆراسی**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌ک درێژه
**رواوگه:** کوردستان (٢٥و؛ ١٣و)؛ وه‌کی به‌شی باشوور (٦و)

**کووله‌که‌ی چێشت**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای کووله‌که
**رواوگه:** باشووری کوردستان (٦و)

**کووله‌که‌ی دۆڵمه** ☜ کوندکێ کۆسه

**که‌بۆت**
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه له ده‌سته‌ی داری لێره‌واری
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)

**که‌ربۆزک**
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه
**رواوگه:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**که‌ربه‌ش:** که‌لبه‌ش، که‌ڵبه‌ش
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه گه‌ڵای وه‌کی که‌نگره، قه‌راخی گه‌ڵاکانی دڕکاوی و په‌ڵه‌په‌ڵه و خاڵی سپی تێدایه و نێوی گه‌ڵاکانی خونچه‌یه‌کی سپی هه‌یه، که‌ر زۆری ده‌خوا؛ وێده‌چێ که‌ربه‌ش هه‌مان کیوار یا براکیوار بێت
**رواوگه:** کوردستان (١٣و؛ ٢٠و)؛ وه‌کی به‌شی باکوور له مه‌ڵبه‌ندی زاری زازا (٨و)

**که‌رتاڵ**
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه چه‌شنی گیای که‌نگره
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)

**که‌رترینه‌ی چه‌رمگ**
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه گوڵه‌کانی سپیه؛ گیای که‌رترینه هه‌مان کاشمه کێویه
**رواوگه:** ڕۆژهه‌ڵاتی کوردستان (٤٩و)

**که‌رترینه‌ی زه‌رد**
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه گوڵه‌کانی زه‌رده؛ گیای که‌رترینه هه‌مان کاشمه کێوی یا که‌میره‌که‌رانه‌یه
**رواوگه:** شاره‌کی بیجاڕ، که‌ل سه‌ڵواتاوا و ره‌شنه‌ش لای سنه، پیرعومه‌ران، قوڵقوڵه‌ی میره‌دێ، کوێستانی نه‌که‌رۆز، ناوچه‌ی سه‌رشیوی سه‌قز و مه‌ریوان (٤٩و)

**که‌رته‌ڕ**
**راڤه:** ١. ناوی جۆرێکی هارویی کێوی تاڵه ٢. به‌ری رووه‌کێکه تاڵه و چه‌شنی گیای هارویه
**رواوگه:** کوردستان (١٣و)

**که‌رته‌شی تۆپزدار:** که‌رته‌شی ما
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای شه‌کرۆکه‌یه
**رواوگه:** گوندی زه‌نان لای سنه (٤٩و)

**که‌رته‌شی چه‌رمه**
**راڤه:** ناوی جۆرێکی گیای شه‌کرۆکه‌یه
**رواوگه:** گوندی هوویه، سه‌رهوویه، ئه‌ویهه‌نگ و ویسه‌ر لای سنه (٤٩و)

**که‌رته‌شی ما** ☜ که‌رته‌شی تۆپزدار

**که‌رته‌وڵ**
**راڤه:** ناوی رووه‌کێکه؛ ژێده‌ری خزری ئێژێت چه‌شنی گاده‌مه‌یه، به‌ڵام من ئه‌م رووه‌که‌م له ناو گه‌نم و جۆی به‌هارا له لادییه‌کانی جه‌بره‌ند، وه‌رگێل، وه‌ڵیو، ده‌شتێ، پاراستان، نواوێ، شیوه‌جۆ، دۆڵه‌توو و چوالانی سه‌رده‌شت دیتووه خه‌ڵک به‌م نێوه ناسیویانه به‌ڵام له گاده‌مه ناچێت به‌ڵکوو له گێزه‌ری کێوی ده‌چێت (گوڵه‌کانی

چەشنی هی گێزەرە و سپیە بەڵام زۆر بۆگەنە، زۆر جوانە بەڵام نزیکی کەوتی لە بۆیا دەرەچی)
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەرچیچەک**
**راڤە:** ناوی روەکێکە لە دەستەی داری لێرەواری
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەرخنکێنە:** کەرکوژە، کەردڕ، قەڵپنک
**راڤە:** ١. ناوی روەکێکە چەشنی لوولووپەڕ یا گوڵەنەورۆزەیە و گەڵای چەشنی سیرە ٢. ناوی روەکێکە بە فارسی (گیسو چمن) ٣. ناوی جۆرێک جۆیە یا گیایەکە چەشنی جۆ کە کەردڕ و کەرکوژەشی پێ ئێژن؛ ویدەچێ گیای کەرخرکێنەش ناوەکەی کەرخنکێنە بێت
**رواوگە:** ١. پاڵنگان، کوێستانی شاهۆ و پاوە ٣. خورخورەی لای سەقز، بیجاڕ و تەنگیوەر لای کامیاران (٤٩و)؛ کوردستان (٣/٩٥و)

**کەرخوو**
**راڤە:** ناوی روەکێکی زەلی کلفت و ئەستوور
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەردڕ** ☜ هەرزنەتاڵە، ٣. کەرخنکێنە

**کەرکرووژە**
**راڤە:** ١. ناوی روەکێکە چەشنی گیای چەقچەقۆکە کەرکرووژەیە، هەنێ لە خەڵکی بان لەیلاخی دیولان و قوروە پێیان وایە هەمان جۆری چەقچەقۆکەیە ٢. ناوی جۆرێکی چەقچەقۆکە ٣. ناوی روەکێکە
**رواوگە:** ١. ناوچەی بان لەیلاخی دیولان و قوروە ٣. گوندی نشووری لای سنە (٤٩و)

**کەرکوژە** ☜ ٣. کەرخنکێنە

**کەرمخ**
**راڤە:** ناوی روەکێکە گەڵای باریکە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەروێشکە گەون**
**راڤە:** ناوی جۆرێک روەکی هەنگەونە
**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٤٩و)

**کەرەپی**
**راڤە:** ناوی روەکێکە بە فارسی (پنبە کوهی) دەبێت
**رواوگە:** کرماشان و ئیلام (٢و)

**کەرەتاو**
**راڤە:** ناوی روەکێکە بە فارسی (پنبە کوهی)یە
**رواوگە:** گوندی زۆنج و رەشنەش لای سنە (٢و)

**کەرەس**
**راڤە:** ناوی روەکێکە کەژی و کوێستانیە، چەشنی گیای بیزا، لاسکەکەی سوورە، زۆر بۆنی خۆشە، بۆ ترشیات دەبێ و گەڵاکەی لە کەرەوز فرەترە؛ لای مەریوان ئێژن کەرەس بۆ ژان و کوچکی گورچیلە بەسوودە
**رواوگە:** ناوچەی هەورامان (هەڵەبجە، باخەکۆن، بیارە، تەوێڵە، کێمنە، نەوسوو، نۆدشە، پاوە، سەولاوا، بێساران، باینگان و چەم ژاوەرۆ) (٢٠و)

**کەریمکاشۆل**
**راڤە:** ناوی روەکێکە بە فارسی (سنبل خطائی ایران) دەبێت
**رواوگە:** کوردستان (٤٩و)

**کەزان**
**راڤە:** ناوی روەکێکە لە کوردەواریدا زۆرە، بەرهەمی دەخورێ، دارێکی زۆر بەتەمەنە، بێنشتێ سپی بە دارەکەوە دەردێت و بۆ دەرمانە
**رواوگە:** باشووری کوردستان و ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەلماس (٣/٤٢و)

**کەزلۆق** ☜ کەزلۆک

**کەزلۆک:** کەزلۆق
**راڤە:** ناوی روەکێکە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەزیک**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی کێویە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەژەسەر**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی کێویە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەشۆڵ:** پاقلەدەیمی

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە چەشنی باقیلەیە

**ڕواوگە:** ناوچەکانی زاراوەی زازا (وەکی سندووس، دێرسیم، خەربووت، سیوەرەک، ئادیەمەن، باکووری دیاربەکر، ئەرزنجان) (٨و؛ ٢٠و)

**کەڤچک**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە لە ناو دۆ، ماس، پەنێر و ژاژی دەکرێ

**ڕواوگە:** دەڤەری بادینان (وەکوو ئاکرێ، ئامێد، دهۆک، زاخۆ، شنگار، شێخان و عەین سفنی) (٢٠و)

**کەڤزان**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی دار یا دارچک

**ڕواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**کەڤی**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەفەشۆر**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٤٩و)

**کەلبەش** ☜ کەربەش

**کەلدڕ** ☜ هەرزنەتاڵە

**کەلکە مارە** ☜ پۆلکەمارانە

**کەلکەخوەشە**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای پۆلکە

**ڕواوگە:** گوندی زۆنج لای مەریوان (٤٩و)

**کەلوەچنە**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** باشووری کوردستان (١و)

**کەڵوو**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٤٩و)

**کەڵە پەز:** توخلیباشی

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** بەشی کوڕانی لای بیجاڕ (٤٩و)

**کەڵەمی**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە چەشنی گیای تووتنە؛ ویدەچێ هەمان ڕووەکەکانی جیڕجیڕۆک، حەشەنوورە، تووتنە کێوی یا تووتنەکەڵە بێت

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**کەڵبەش** ☜ کەربەش

**کەڵبەهەنجیر:** باقوو، باتسکە

**راڤە:** ١. ناوی ڕووەکێکە لە جۆری هەنجیر ٢. ناوی هەنجیرێکە کە بێتامە و نەگەیشتووە

**ڕواوگە:** کوردستان (٩و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**کەڵواڵ**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی بەهارییە، بنکی دەخورێ

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**کەڵواڵک**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی، بەهارانە هەس و گوڵێکی سووری وەک پیاڵەی هەیە؛ ویدەچێ کەڵواڵک هەمان گوڵە ڕازاو (گوڵە پیاڵە) بێت

**ڕواوگە:** کوردستان (٢٠و)

**کەڵەدرک**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** گوندی کەرجۆ و کۆڵەسارە لای سنە (٤٩و)

**کەڵەشیشە**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: گوندی حەسەناوا لای سنە (٩٤و)

**کەڵەوێ**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکی گەڵا پانی بەرزە و دڕکەکانی فرە تیژن

ڕواوگە: کوردستان (٢٠و)

**کەڵەوێ:** گرگاز، گرگازۆلە، گرگازوڵە

ڕاڤە: ١. ناوی ڕووەکێکی بەهارییە کە بە کوڵاوی و سوورەوکراوی دەخورێ، بە پیری دەبێت بە چەقڵ، خوێنی خەست تراو دەکا؛ ئەم ڕووەکەم لە گوندەکانی نواوێ، شیوەجۆ، چوالان، دۆڵەتوو، پاراستان و جەبرەندی سەردەشت لە ناوی گەنم و جۆدا دیت، چەشنی گێزەرە جافی و گێزەرە کێوییە ٢. ناوی ڕووەکێکی دڕکاویە ٣. ناوی ڕووەکێکی گەڵا پانە کە بە زەویدا بڵاو دەبێتەوە ٤. ناویتری ڕووەکی دڕکەکەڵەوێ

ڕواوگە: ١و ٣. بەشی باشوور (٦و؛ ١و) ٢. کوردستان (١٣و)

**کەما:** کەمامرۆژە، کەمازەنگ

**کەمازەنگ**

ڕاڤە: ناوی جۆرێکی ڕووەکی کەمایە؛ ژێدەری خزری ئێژێت زورهان و پسپۆڕانی کوردستان لە سەر ئەو باوڕن شەش جۆر کەما هەیە

ڕواوگە: باشووری کوردستان (٦و؛ ١و)

**کەمامرۆژە**

ڕاڤە: ناوی جۆرێکی ڕووەکی کەمایە؛ ژێدەری خزری ئێژێت زورهان و پسپۆڕانی کوردستان لە سەر ئەو باوڕن شەش جۆر کەما هەیە

ڕواوگە: ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**کەمبەر**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکی کێویە

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**کەمبەڵۆک**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکی کێویە دڕکاویە

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**کەنێر** ☜ کەنێرە

**کەنێرە:** کەنێر

ڕاڤە: ١. ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی داری کوێستانی گەڵاکانی چەشنی هی دارچکی کێکفن، کاتی ئاور گرتن بۆنی خۆشی لێوەدێت ٢. ناویتری گیا پلوێن (ئێستێ مەندۆک و گیاخاو و کەنێر/ سوێسن و بەیبوون و شەوبر و شلێر) ٣. ناوی ڕووەکێکە گوڵی جوانی چکووڵەی هەیە و هەتا ١٠ سانتیمتر بەرز دەبێت

ڕواوگە: ١. باشوور (٦و) ٢. ڕۆژهەڵاتی کوردستان ٣. وەکی حەسەناوای لای سنە (٩٤و)

**کەوات**

ڕاڤە: ناوی جۆرێکی دار نارنج

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**کەورنگان**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە لە جۆری دانەوێڵە کە کاتی قڕەساڵی تێکەڵ بە گەنمیان دەکرد بۆ خواردن، هەروەها بە گەنمی تێکەڵ بە هەرزنیش ئێژن؛ وێدەچێ جۆرێکی گیای هەرزن بێت

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)؛ و باکوور (مەڵبەندی زاری زازا) (٨و)

**کەوڵەپیر**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکی زەردە

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**کەوەبی** ☜ کەوەتووڵ

**کەوەتووڵ:** کەوەبی

ڕاڤە: ناوی جۆرێکی دار بییە، چێوی ئەم بییە ڕەق و ئەستوورە بۆ سەبەتە چنین ناوێت

ڕواوگە: گوندی ڕەشنەش لای سنە(٩٤و)

**کەوەجۆ**

ڕاڤە: ناوی جۆرێکی گیای جۆ، ڕەنگی بۆرە

ڕواوگە: کوردستان (٧٨و)

**کەوەلۆ** ☜ لۆشین

**کەویرە**

**راڤە:** ١. ناوی روەکێکە بە فارسی (کهورک) دەبێت ٢. ناوی روەکێکی خۆڕسکی بێروونە

**رواوگە:** لای دیلۆران (٦٠و)

**کەیارک** ☜ قارچک

**کیارک**

**راڤە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**کیرف**

**راڤە:** ناوی روەکێکە گەڵای چەشنی هی دارەبییە و بۆ دەرمانی کوتیاگ و مانیاگی ماسوولکە و ئەنام دەبێت کە لە سەری دایدەنن

**رواوگە:** ناوچەی هۆزی لەک لە ئیلام، کرماشان و لوڕستان (٢و)

**کیرکەخەرانە**

**راڤە:** ناوی روەکێکە چەشنی گیای گنۆرە و ناشخورێت

**رواوگە:** لای کرماشان (٤٩و)

**کیسوفس**

**راڤە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**کیوال**

**راڤە:** ناوی روەکێکی شیلەدارە کە ئەگەر ببڕیت جەوێکی لێ دیت، وشکەوە بێت وەک بنێشت دەجاوێت؛ ڕەنگە هەمان کۆکلاش یا گیابنێشت بێت، ئەگەرچی وشەکە بە کیوارەوە نزیکە

**رواوگە:** لای کرماشان (٤٩و)

**کێرات**

**راڤە:** ناوی روەکێکە لە جۆری دارچک

**رواوگە:** کوردستان (١٣او)

**کێرقازی**

**راڤە:** ناوی روەکێکی گەڵاپانی بەنەوشە

**رواوگە:** کوردستان (١٣او)

**گابرە**

**راڤە:** ناوی روەکێکە لە زەلکاو و مێرگاندا شین دەبێت؛ وێدەچێت گیای گاورە بێت چونکا گاورەش لە وەها جێگای شین دەبێ و ناوەکەشیان لێک نزیکن

**رواوگە:** کوردستان (١٣او)؛ وەکی بەشی ڕۆژهەڵات (٤٩و)

**گابرەسەوزە**

**راڤە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گاپلووک**

**راڤە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** کوردستان (١٣او)

**گاپەرچۆک:** گاپەرچێڤک، گاپەرچینکە

**راڤە:** ناوی روەکێکە مانگا خۆشی لێ دێ؛ گیای گاوانەش مانگا خۆشی لێ دێت

**رواوگە:** کوردستان (١٣او)

**گاپەرچێڤک** ☜ گاپەرچۆک

**گاپەرچینکە** ☜ گاپەرچۆک

**گاتۆسی**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای تێسووە، دڕکەکانی ڕەق و گەورەترە

**رواوگە:** کوێستانی شاهۆ و گوندی لۆن لە کامیاران (٤٩و)

**گاخوشیل**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی روەکی خوشیلکە کە لە هەموو جۆرەکانی گەورەترە

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٤٩و)

**گارنگا**

**راڤە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**گارنگان**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گاسۆس**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە تێکەڵی شیرێژی دەکەن تام و بۆنی خۆش بێت

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گاکوێرکەرە:** ناویتری گیای کاسەشۆرە

**گاگلێنکە**

**راقە:** ١. ناویتری وێنجە دڕکینە ٢. ناویتری گوراڵە جنانە ٣. ناوی ڕووەکێکە، ئەگەر گا و مانگا بیخوات گێژی دەکا

**ڕواوگە:** گوندی میانە و زۆنج و کوێستانی کۆسالان لای مەریوان (٩٤و)

**گاگوێ:** گوێبەرازە

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** کوردستان (٢٠و)؛ وەکی گوندی باخان، بەردی سپی لای مەریوان (٩٤و)

**گاگوڵەک**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گاگۆز**

**راقە:** ١. ناوی ڕووەکێکە لە جۆری گیای لوبیا ٢. ناویتری گیای ولێرە

**ڕواوگە:** کوردستان (٢٥و؛ ١٣و)

**گاگەون**

**راقە:** ناوی جۆرێ گەونە، لە ڕەشە گەون بووچکترە، پەلوپۆی کراوەترە، بۆ تفاقی ئاژەڵە لە زستاندا دەبێت، لقەکانی هەتا ١٦٠س.م ئەندازە گیراوە

**ڕواوگە:** گوندی گواز، کوێستانی شاهۆ، کوێستانی قەڵەبەرد، بلچەسوور، کوێستانی کۆسالان، کانیحسێنبەگ، هەجیج لای مەریوان، پاڵنگان، لۆنی سادات لای کامیاران، ڕەشنەش، زەنان لای سنە و پاوە (٩٤و)

**گاگیلە**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکی سوێرە و لە شۆرەکاتی ناوچەکانی بێروونەدا شین دەبێ

**ڕواوگە:** لای دیلۆڕان (٦٠و)

**گالووف**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکی کێویە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گاودومە**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە بێخەکەی چەشنی دار و چیلکە بەکار دێت؛ لە ناوچەی کۆماسی و کەلاتەرزانی سنە و مەریوان بێخی گیای تالگ، پێلوێژەی پێ ئێژن کە بۆ سووتەمەنی کوانوو دەبێت، وێدەچێ هەمان گیای گادەمە بێت، ئەویش بنێکی وەک پێلوێژەی هەیە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گاورمە**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە؛ وێدەچێ هەمان گیای گادەمە (گاورمە) بێت

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گاوڕ** ☜ **گاورە**

**گاورە:** گاوڕ

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە گەڵای چەشنی هەڵیترگە و هێڵێ سپی لە ناو گەڵاکانیدایە و لاسکی چەشنی گیاپیزڵی قەراخە چەمە، پتەوە و گران لە زەوی هەڵدەکنرێت، لە مێرگ و زۆنگدا شین دەبێت

**ڕواوگە:** مێرگەکانی کێوی شێخاڵی و قشلاخی گوندی باقلاوای شێخ حسەین لای مەریوان (٧٨و)

**گاوەدمە**

**راقە:** ناوی ڕووەکێکە گەڵاکانی چەشنی گوڵە گوارە گوارەن و گەڵاکانی ئەستوورن؛ وێدەچێ

هەمان گیای گادەمە بێت

**رواوگە:** خورخورەی سەقز (٩٤و)

**گاوەسپووک**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە کێوی و سەلک و پیوازەکەی دەخورێ، پیوازەکەی سپیە و چەشنی هی پیشۆکە، گەڵاکانی درێژە و چەشنی هی پیچکن بەڵام چوار سووچن

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گاوەسیرۆک**

**راڤە:** ناوی رووەکێکی گوڵ زەردی کوێستانیە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١٦و)

**گردیشک**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە چەشنی گیای هالیکۆکە و لە شاخ و کێو شین دەبێ

**رواوگە:** کوردستان (١٤٢/٣و)

**گرژاڵک:** گوژالک

**راڤە:** ناوی رووەکێکە نیو گەز پتر بەرز نەبێت، تامی تاڵە و دەکرێتە گەسکی لای خەرمان و جەز؛ وێدەچێ گرژالک هەمان گیای گووژالک بێت کە لە بێژەدا گۆڕابێت

**رواوگە:** کوردستان (٢٠و)

**گرکەدەیمی** ☜ گرکەکوردی

**گرگاز** ☜ ١. کەڵەوێ

**گرۆچەڵی**

**راڤە:** ناوی رووەکێکی کێویە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گریشک**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** کوردستان (٩٤و)

**گرکە:** زرکەتاڵە، گرکەکوردی، گرکەدەیمی

**گرکەدەیمی** ☜ گرکەکوردی

**گرگازۆڵە** ☜ ١. کەڵەوێ

**گرگازۆڵە** ☜ ١. کەڵەوێ

**گرگر**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە لە جۆری گیای باقلە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گزرکە**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە؛ گزر بە واتای گێزەریش هاتووە

**رواوگە:** گوندی نیەر لای کامیاران، هەشەمێز لای سنە و ناوچەی هەورامان (٩٤و)

**گزرۆکە**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە؛ گزر بە واتای تالێتۆز و گێزەریش هاتووە هەروەها گزەرکە بە گیای کراوی ناوبراوە

**رواوگە:** گوندەکانی ناوچەی هەورامان (٩٤و)

**گزگز**

**راڤە:** ناوی رووەکێکی گەڵا وردە و دڕکاوی کە بسووتێ گزەی لێدێ

**رواوگە:** کوردستان (٢٠و)

**گزگزە:** بڕەسۆرە

**راڤە:** ١. ناوی بنە دارێکە ٢. ناوی رووەکێکە گەڵای وردێ هەیە و بۆ دالیک و گزرەی پاتاڵ دەشێ ٣. ناوی رووەکێکە بۆ گەسک، چێ کردنی خانووی هاوینی و کەپر کەڵکی لێ وەرئەگرن

**رواوگە:** ١. ناوچەی گەرمیان (وەکی نیلام، بەشی خوارووی کرماشان، خانقین، دوبس، بەلەدرووز، مەندەلی، بەدرە، جەلەولا، سەعدیە، مەخموور، کەرکووک، دوزخورماتوو) (٢٠و)؛ ٢ و ٣. و بەشی باشووری کوردستان (١٦و؛ ٢٩و)

**گزگەقوڵە**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گزی چارەکێفی**

**راقە:** ناوی روەکێکە؛ ویدەچێ لە دەستەی دارچکی گزگچار بێت

**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٤٩و)

**گزیچکەسەرە**

**راقە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٤٩و)

**گزیخۆشە**

**راقە:** ناوی روەکێکە؛ لە زاراوەی ئەردەلانیدا گزی بە واتای گەسکە

**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٤٩و)

**گزیلکەسەرە** ☜ ئاسنسەرە

**گژنیژەکێویلە** ☜ تاولەکێفیلە

**گژۆڵ**

**راقە:** ناوی روەکێکە لە دەستەی دار یا دارچکی لێرەواری

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باکوور (٢٠و)

**گسکەحەوشە**

**راقە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (او)

**گفرژنەک**

**راقە:** ناوی روەکێکی کێویە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گلک**

**راقە:** ١. ناوی روەکێکە ٢. بە واتای لاسکی بێدانەی گەنمەشامی

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گلگل** ☜ گلگل

**گلۆلۆک** ☜ گلۆلە

**گلۆلە:** گلۆلۆک

**راقە:** ناوی روەکێکە

**رواوگە:** ناوچەی هەورامان (هەلەبجە، باخەکۆن، بیارە، تەویلە، کێمنە، نەوسوو، نۆدشە، پاوە، سەولاوا، بێساران، باینگان و چەم ژاوەرۆ) (٢٠و)

**گلێخە**

**راقە:** ١. ناویتری گیای گیلاخە ٢. ناویتری گیای گەپلە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گلێنکە**

**راقە:** ناوی روەکێکە؛ ویدەچێ لە گیای گاگلێنکە بچێت

**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٤٩و)

**گلاز:** گەلاز

**راقە:** ناوی روەکێکە لە شێوەجۆری هەڵووچە سوورە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و؛ ٤٩و)؛ وەکی بەشی باشوور (١٦و)؛ ناوچەی هەورامان (هەلەبجە، باخەکۆن، بیارە، تەویلە، کێمنە، نەوسوو، نۆدشە، پاوە، سەولاوا، بێساران، باینگان و چەم ژاوەرۆ) (٢٠و)

**گلکاس**

**راقە:** ناوی روەکێکە بستێ بەرز ئەبێت، گەلای وەسە تەرەتیزە، بن خڕ و شیرینە و گرێگرێیە و تالیشی هەیە بەلام جۆری شیرینی دەخورێ

**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**گلگل:** گلگل

**راقە:** ١. ناویتری هەرزنە گەورە ٢. ناویتری گیای گەسک

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گلەوەز** ☜ قرێژەبەرد

**گنهوور**

**راقە:** ناوی روەکێکە چەشنی گیای شێلمە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گوارک** ☜ قارچک

**گوانەمانگا**
راقە: ناوی ڕوەکێکە چەشنی گوانی مانگایە و دەخورێت
ڕواوگە: کوردستان (٣/١٤٢و)

**گورگەکوژە**
راقە: ناوی ڕوەکێکە
ڕواوگە: لە ڕوەکەکانی ؟ (٩٤و)

**گورگەمزە**
راقە: ناوی ڕوەکێکە؛ وێدەچێ هەمان گورمزە یا هورمزە بێت
ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گورمزە:** مارانگاز
راقە: ناوی ڕوەکێکە
ڕواوگە: باشووری کوردستان (٢٠و)

**گوڕنووک**
راقە: ناوی ڕوەکێکە لە دەستەی دارچکی درکاوی؛ بە وشەی گیای گرنووکەوە نزیکە
ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوزەرینگ**
راقە: ناوی ڕوەکێکی گوڵ سوور و بۆنخۆشە و لە ناو بێسانا ئەڕوێ، بە وشککراوی لە مالاندا هەڵیدەگرن
ڕواوگە: باشووری کوردستان و لای ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەڵماس (٣/٤٢و)

**گوژاڵک:** گرژالک

**گوش**
راقە: ناوی ڕوەکێکە لاسکە بە کوتراوی ئەڕێسن و ئەیکەنە بەن وەکی گۆنی بەن و گۆنی وشی لێ ساز ئەکەن؛ ژێدەری سەدرەدین بۆ گیای (گاوێنە) و بامیەی داناوە
ڕواوگە: کوردستان (٨و)

**گوشەنەوە** ☜ تووتنەکێوی

**گولبزا**
راقە: ناوی ڕوەکێکی زەردی بەهارییە
ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گولچیت**
راقە: ناوی ڕوەکێکی کێویە
ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوڵچیچەک**
راقە: ناوی ڕوەکێکە لە دەستەی گوڵ، چەن گوڵ دەرئەکات، گوڵی سوورە و بۆنخۆشە
ڕواوگە: باشووری کوردستان و ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەڵماس (٣/٤٢و)

**گولسۆراف**
راقە: ناوی ڕوەکێکە گەزێ بڵیند دەبێ، ژیانی مانگ و نیوێکە، فرەتر لە ناو بێستانا شین دەبێ
ڕواوگە: باشووری کوردستان و ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەڵماس (٣/٤٢و)

**گوڵسەندەل**
راقە: ناوی ڕوەکێکە لە مانگی ئاداردا شین دەبێ
ڕواوگە: باشووری کوردستان و ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەڵماس (٣/٤٦و)

**گوڵمەشک** ☜ پێقەلە

**گولەزەر**
راقە: ناوی ڕوەکێکە لە دەستەی گوڵ، بۆنخۆشە، لە مانگی ئادار شین دەبێ و لە گولاندا گوڵ دەکا
ڕواوگە: باشووری کوردستان و ورمێ، ماکۆ، خۆی، سۆمای برادۆست و سەڵماس (٣/٤٢و)

**گولەفوراگە**
راقە: ناوی ڕوەکێکە بە کولاتەیی دەخورێت
ڕواوگە: کوردستان (٣/٥٠و)

**گولەک**
راقە: ناوی ڕوەکێکە، ئەبێتە هۆی بای ناوسک و باکردنی سکی ئاژەل، هەر ئاژەلێ بیخوات تووشی باکردن ئەبێت
ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گولیفک**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گولینە**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵی کێوی کە گوڵەکانی زەردی کەمڕەنگە
**رواوگە:** لای کرماشان (٩ئو)

**گولێ‌گیو**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی گوڵسپیە کە ئەوسا بۆ سپی کردنـەوەی پـێڵاوی کـڵاش کـەڵـکیان لـێ وەردەگرت، ئیستا بۆ ڕەنگرێژی و خانووسازی بەکاری دەبەن؛ لای کرماشان بە کلاشی کوردی ئێژن گیوە کە چووەتە ناو زوانی فارسیش
**رواوگە:** دەڤەری کرماشان (٩ئو)

**گوڵ‌ئەلما**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی کێوی و گوڵ زەردە
**رواوگە:** دەڤەری کرماشان (٩ئو)

**گولالەگورگانە**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە
**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵ باوەڕەزوو:** گوڵ باوەرەزوو
**راڤە:** نـاوی ڕووەکێکـی دەرمانیـە بـە فارسـی (گـل باد) دەبێت
**رواوگە:** لای کرماشان (٩ئو)

**گوڵ باوەرەزوو** ☜ گوڵ باوەڕەزوو

**گوڵ‌بەندووشکی**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە چەشنی گوڵە پۆپەکەڵەشێرە و لە بنەماڵەی ئەسپەناخە
**رواوگە:** کوردستان (٢٥و)

**گوڵ‌تۆپ**
**راڤە:** ١. ناوی‌تری گوڵ هەنگ ٢. نـاوی‌تـری گیـا زەڕنێقە ٣. ناوی دارچکێکە
**رواوگـە:** ڕۆژهـەلاتـی کوردسـتان ٣. وەکـی قولقولەی میرەدێ لای سەقز (٩ئو)

**گوڵ‌چیچک** ☜ قەلەفسە

**گوڵ‌خاینە**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی بەهاریە کە لەتەک چێشتی خاگینە و کووکوو لێی‌دەنن
**رواوگە:** لای کرماشان (٩ئو)

**گوڵ‌خنجەر**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە
**رواوگە:** ڕێگای بیجاڕ بۆ تیکاب (٩ئو)

**گوڵخەنی**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی داروویە، بـە واتـای چێشـتی بڕێشینی وردە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گوڵدەخوێن**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵی جـوانی یـا ئینجانەیی، گوڵێکی سوور و فرە بۆنخۆشی هەیـە، هـی کـەژ و کوێسـتانە، چـەنـد لقێـک و چـەنـد نێرتکێک دەرئەکات و گوڵی هەموویان سەرشۆڕ ئەکـەنـەوە و ڕەنگـی سـوور و ئـاڵ و پرتـەقاڵـیە؛ ڕەنگە گوڵە شلێر بێت
**رواوگە:** باکووری کوردسـتان و دەڤەری بادینـان (وەکوو ئاکرێ، ئامێد، دهۆک، زاخۆ، شنگار، شێخان و عەین‌سفنی) (٢٠و)

**گوڵڕنە**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە
**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵڕەش**
**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە
**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵشەیتان** ☜ قورسی‌کەمەر

**گوڵ‌عەزرەتی**
**راڤـە:** نـاوی ڕووەکێکـە؛ وێـدەچـێ هـەمـان گوڵـە ئاوەنیا بێت

ڕواوگە: گوندی باخان لای مەریوان (٩ئو)

**گوڵقاخلی** ☜ ئاسنسەرە

**گوڵکالانە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکی کێویە

ڕواوگە: باشووری کوردستان (٦و)

**گوڵکەماسە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە لە جۆری داری بادام

ڕواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵکێژۆڵە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی، گوڵی بێبۆن و شین و شپی هەیە

ڕواوگە: کوردستان (٢٠و)

**گوڵکیسەڵ**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە؛ گولالە سوورەی دەشت

ڕواوگە: گوندی نشوور لای سنە (٩ئو)

**گوڵ گەوەن**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵگەوەند**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵماسی**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵمیئاڤ**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: باکووری کوردستان (٢٠و)

**گوڵمێخەک**

ڕاڤە: ١. ناوی ڕووەکێکە گوڵەکانی جوان و سووری ئاڵ تا سووری تاڵ، هەمان گیای لیفەشرِیە ٢. ناوی ڕووەکی گوڵی مێخەک ٣. ناوی‌تری گیای سمل

ڕواوگە: کوردستان (٩ئو؛ ١٣او)؛ وەکی مەڵبەندی زاری ئەردەلانی (٨و)

**گوڵمێو**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: کوردستان (١٣او)

**گوڵنکەسپیکە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: باشووری کوردستان (٦و)

**گوڵنۆکە** ☜ گەپڵە

**گوڵنووکەفەقیان** ☜ ڕیحانەکێفیلە

**گوڵەئەرخەوان**

ڕاڤە: ١. ناوی‌تری پووشەکەوە (زرەشەوبۆ) ٢. ناوی‌تری گوڵبەهار ٣. ناوی‌تری گوڵە ئەروانە ٤. ناوی‌تری گوڵە ڕازاوە

ڕواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵەبابردەڵە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە؛ گیای‌ترمان بە ناوی بابردەلە هەیە

ڕواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ئو)

**گوڵەبۆرە**: گیاگوڵەبۆرە

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: گوندی فەتاحاوا و بست لای دیواندەرە (٩ئو)

**گوڵەبەبەشە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە

ڕواوگە: کوردستان (٨و)

**گوڵەبەبەشە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکی کێویە

ڕواوگە: کوردستان (١٣او)

**گوڵەبەرۆژەی چویتی** ☜ قاپەشکێنە

**گوڵە پێغەمبەرە**

ڕاڤە: ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵ، لە ماڵەوە بەخێوی دەکەن، بە چوار دەوری گوڵە درێژەکانی شتۆکەی خڕ دەر ئەکات چەشنی نۆکە فەریکەیە

دەخورێ، وشکی دەکەن و دەیهاڕن و ئەیکەنە نان؛ هەمان گوڵەدانە بەڵام ژێدەری (٨و) پێموابێ چاکی ڕاقە نەکردووە و لەگەڵ گوڵەدانا جیاوازی داناوە

**رواوگە:** کوردستان (٨و)

**گوڵەپەرێزە**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی، گوڵی ڕەنگاوڕەنگی جوانی دێنی و پەڕی گوڵەکانی و لاسکی هەموو خاڵخاڵە

**رواوگە:** کوردستان (٢٠و)

**گوڵەپیاڵە**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکی دەرمانیە؛ ویدەچێ هەمان گوڵە ڕازاو بێت بەڵام گیایێکیتر هەیە بە ناوی کەلواڵک کە گوڵەکانی وەسە پیاڵە

**رواوگە:** بەرزاییەکانی بەمۆ و سەرتەک لای جوانڕۆ (١٩و)

**گوڵەتاڵە**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکی دەرمانیە چەشنی مەڵهەم لە برینی چڵکاوی دایدەنێ ساڕێژی دەکاتەوە؛ چەند جۆر گیامان هەیە بە ناوێ تاڵگ

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١٩و)

**گوڵەتگەرە** ☜ بنگەژیلە

**گوڵەچاوڕەش**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکی بۆنخۆشە بە بەرزایی ٢٠ سانتیمتر، گوڵەکانی سێ یا چوار پەلیان هەیە

**رواوگە:** گوندی میانە لای مەریوان (٤٩و)

**گوڵەچاوێشە**

**ڕاقە:** ١. ناویتری گوڵەحاجیانە ٢. ناویتری گوڵە هێرۆ

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان ١. وەکی گوندی گڵیە لای مەریوان (٤٩و)

**گوڵەحاجیانە**

**ڕاقە:** ١. ناوی گشتی بۆ جۆرەکانی بەیبوون ٢. ناویتری گوڵەحاجیلێ ناوبەرد ٣. ناویتری گوڵەحاجیلێ زەرد و بەرز ٤. ناویتری گوڵاڵە چەرمەی مەڵهەمی

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٤٩و)

**گوڵەخەنە**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی ڕۆژهەڵات (٤٩و)

**گوڵەدۆمە**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی کە گوڵی زەرد و زلە دەگرێت؛ ویدەچێ هەمان گیادۆمە بێت

**رواوگە:** کوردستان (٨و)

**گوڵەڕنە**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکە چەشنی گیای بایناجانە ڕەشەیە؛ ویدەچێ لە جۆری تەڕەسێڵمانە بێت

**گوڵەڕۆمی**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکە مێرووی هەنگ فرە پێی خۆشە و هەنگەوانان لە بەر دریای خەڵەف و گۆزەی هەنگدا دایدەنێ؛ لە گوندەکانی چواڵان، زمزیران، گۆڵێ، سوێرێ، نستان، چواڵان، پاراستان، دەشتێ، نواوێ، دۆڵەتوو، بێوران، کانیزەرد و شەڵماش لای سەردەشت، کەڵەکاوێ، کاوڵان، کانیەسپی و کانیەڕەش لای مەهاباد ئەم ڕووەکەم بەو قازانجەوە کە خزری هیناویە، دیتووە، ویدەچێ هەمان گوڵەڕۆنە بێت

**رواوگە:** گوندی تووارمەڵا، گەڵێن، کەل تەیتوور، خانەگای گەڵێن، دادانەی کەمانگەر، ڕەشنەش لای سنە و کوڕەمیانە و زۆنج لای مەریوان (٤٩و)

**گوڵە ڕەحەتی**

**ڕاقە:** ناوی ڕووەکێکە بە عەرەبی (زهرە القمـع)ی پێئێژن؛ ویدەچێ هەمان گیاڕەحەتی یا کاسەگوڵ بێت

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١٦و)

**گوڵەڕێحانە**

**راقە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گوڵەزەرد**

**راقە:** ١. ناوی‌تری گوڵماس ٢. ناوی‌تری زەرنیقە ٣. ناوی‌تری ولەزەرد ٤. ناوی‌تری گوڵەهەنگ ٥. ناوی رووەکێکی دڕکاویە لە کێو

**رواوگە:** ١. گوندی خەناناوای نزیک کێوی بەوروپەریشانی قوورەوە، حسێناوای نزیک کوێستانی پەنجەعەلی لای قوورەوە، خواشت لای سەولاوا ٢ و ٣. تەنگی‌سەر، نیەر و کۆلەسارە لای کامیاران (٩٤و)؛ ٥. کوردستان (١٣و)

**گوڵەزمق**

**راقە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گوڵەزەنگ** ☜ شەرمین

**گوڵەزەنگیانە**

**راقە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گوڵەسێ‌کووزە**

**راقە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گوڵەسەعاتی**

**راقە:** ناوی رووەکێکە بۆ ژانەسک و سووری مانگانە و سکچوون بەسوودە، خەوهێنەریشە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گوڵەسەگانە**

**راقە:** ١. ناوی رووەکێکە چەشنی گوڵ کەوو بەڵام بۆنی نیە و گوڵەکانی چەشنی گوڵەگوارەن، ئێژن تەنیا کرمێ لەسەری ئەنیشێت ٢. ناوی رووەکێکە ٣. ناوی رووەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی ٤. ناوی‌تری دارچکی دلیق

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٦و؛ ٩٤و)

**گوڵە شاخۆچکە:** گوێ‌مشکە

**راقە:** ناوی رووەکێکە بە عەرەبی (قرنیە، زهرە القرون)ی پێ‌ئێژن

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١٦و)

**گوڵە شەوکوێرە**

**راقە:** ناوی رووەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١و)

**گوڵەعەجووزە**

**راقە:** ناوی رووەکێکە لە دەستەی گوڵی ئینجانە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١و)

**گوڵەگورگە**

**راقە:** ناوی رووەکێکی پاییزی و گوڵ‌سوورە

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گوڵە گەون**

**راقە:** ناوی جۆرێک رووەکی هەنگەونە

**رواوگە:** ڕۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گوڵەلێوە**

**راقە:** ناوی رووەکێکە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (١٩و)

**گوڵەمار**

**راقە:** ناوی رووەکێکە بە عەرەبی (عین البزون) و ناوی زانستیەکەی (*Vinca herbacia*) هاتووە

**رواوگە:** باشووری کوردستان (٢٣و)

**گوڵەمارانە**

**راقە:** ١. ناوی جۆرێکی بێژان کە گەڵاکانی باریکە چەشنی کرم؛ وێدەچێ هەمان بۆژانە کوێستانی بێت چونکا ناوی زانستیەکەی وشەی لاتینی کرمی تێدایە ٢. ناوی‌تری گوڵە هەنگ

**رواوگە:** گوندی خەرکە لای دیواندەرە (٩٤و)

**گوڵە مەشقانە** ☜ چارەچەقیلە

**گوڵەمەنیجە**

راڤە: ناوی روەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی کە بەخێوی دەکەن

رواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩٤و)

**گوڵەمێش**

راڤە: ناوی روەکێکە بۆ کوشتنی کرم دەبێت

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوڵەنار**

راڤە: ناووی روەکێکی دەشتیە کە گوڵەکەی چەنی گوڵ هەنارە

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوڵە نیسانۆک**

راڤە: ناوی روەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی کە لە مانگی ڕۆمی نیساندا دەردێ

رواوگە: باشووری کوردستان (١٦و)

**گوڵەهرچ**

راڤە: ناوی روەکێکی گەلا پان و گوڵ بەنەوش؛ لای کرماشان هرچ بە واتای ئاژەڵی ورچە

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوڵهەسێڵ**: بێڤیزان

راڤە: ناوی روەکێکە؛ لە بنزاراوەی ئەردەلانیدا هەسێل بەواتای ئستێری ئاو

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوڵهەناری**

راڤە: ناوی روەکێکە

رواوگە: گوندەکانی لای قوروە و دیولان (٩٤و)

**گوڵی باجیقەدری**

راڤە: ناوی روەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی

رواوگە: باشووری کوردستان (او)

**گوڵیشووشان**

راڤە: ناوی روەکێکە لە دەستەی گوڵی جوانی یا ئینجانەیی؛ گیای شیشانیش هەیە کە وشەکەی فرە گوڵی شووشانەوە نزیکە

رواوگە: دەڤەری بادینان (وەکوو ئاکرێ، ئامێد، دهۆک، زاخۆ، شنگار، شێخان و عەین سفنی) (٢٠و)

**گوڵیمەرۆ**

راڤە: ناوی روەکێکە گوڵەکانی چەشنی سرنایە و زەرد رەنگە

رواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩٤و)

**گونپسیک**

راڤە: ناوی روەکێکە، بەرەکەی چەشنی گونی پشیلەیە

رواوگە: کوردستان (١٣و)

**گونحاجیلەقلەق**

راڤە: ناوی روەکێکە لە جۆری گیای شلەجاف

رواوگە: گوندەکانی دووشان، سەڵواتاوا، نایسەر لای سنە (٩٤و)

**گوندک**

راڤە: ناوی روەکێکی ژەحراویە، بەواتای گونکە هەویرە

رواوگە: کوردستان (١٣و؛ ٢٥و)

**گونشەیتان** ☜ قورسیکەمەر

**گونقەلاخ**

راڤە: ناویتری گیای شلەجاف

رواوگە: دەڤەری بیجاڕ (٩٤و)

**گونکاورکە** ☜ گونکاورە

**گونکاورە**

راڤە: ناوی روەکێکی ئالیکیە بە جوانی دەخورێ

رواوگە: ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩٤و)

**گونکاورێلە** ☜ گونکاورە

**گونکەسەگانە** ☜ گونگونە سەگانە

**گونکەڵەبابە** ☜ دڵەشێرە

**گونکەڵەشێرە** ☜ دڵەشێرە

**گونگونەسەگانە**: گونەڵەسەگانە، گونەڵەسەگان، هێلکەسەگانە، گونکەسەگانە

راڤە: ١. ناوی ڕووەکێکە؛ وێدەچێ هەمان گیای گونەسەگانە بێت کە ئەگەری شەیە جۆرێکی هەنگەون بێت، لە هەندی شوێنی کوردستانی خۆشەویستدا ناوی‌تری گیای شلەجافە ٢. ناوی ڕووەکێکە بە فارسی (پیاز موشی) دەبێت، بۆ ڕەنگاندنی بەن بەکار دەچێت

ڕواوگە: ٢. کوردستان (١٣و)؛ وەکی گوندی سوورکەوڵ لای مەریوان و ناوچەی خوڕخوڕەی سەقز (٤٩و)

**گونە پشیلە**

راڤە: ناوی ڕووەکێکی گەلا زۆر ورد و گوڵ سپیە

ڕواوگە: کوردستان (٢٠و)

**گونە ئەسەگان** ☜ گونگونە سەگانە

**گونە ئەسەگانە** ☜ گونگونە سەگانە

**گوهبزن**

راڤە: ناوی ڕووەکێکە؛ بەواتای گوێبزنە؛ لە هەندێ شوێنی کوردستانا بە گیای ڕکێشە ئێژن

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گوهکتک**

راڤە: ناوی ڕووەکێکە؛ واتای سۆرانی گوهکتکی بادینی هەمان گوێپشیلەیە

ڕواوگە: باکووری کوردستان و دەڤەری بادینان (وەکوو ئاکرێ، ئامێد، دهۆک، زاخۆ، شنگار، شێخان و عەین‌سفنی) (٢٠و؛ ١٣و)

**گوهکەرک**

راڤە: ناوی ڕووەکێکە بۆ دەرمانی نەخۆشی مایەسیری دەشێ؛ وێدەچێ هەمان ڕووەکی خاقز، گیامایەسیری یا شانۆکە بێت

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گـویژ:** سوورە، زەردە، ڕەشە، سایلە، هەویرە، ڕیخە، کۆڵ، چەرمگ، کوردەکوژە، جنانە، گەرەگۆیژ، بلچەسوورە، بلچەڕەشە، بلچەزەردە، مەرە، خاڵخاڵی، سنجە، ڕەشباڵە

**گویژەتەعەد**

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

ڕواوگە: ناوچەی زاراوەی زازا (وەکی سندووس، دێرسیم، خەرپووت، سێوەرەک، ئادیەمەن، باکووری دیاربەکر، ئەرزنجان) (٢٠و)

**گویژەجنانە**

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە، ڕەنگی ڕەشی ورد و ناڵەبارە

ڕواوگە: گوندی نشوور لە چەمشاری سنە (٤٩و)

**گویژەچەرمگ**

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

ڕواوگە: کوردستان (٧٨و)

**گویژەڕێخە**

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

ڕواوگە: کوردستان (٧٨و)

**گویژەڕەشە**

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

ڕواوگە: گوندی بلچەسوور و کێوی قەڵەبەردی مەریوان (٤٩و)

**گویژەزەردە:** بلچەزەردە

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

ڕواوگە: گوندی بلچەسوور و کوێستانی قەڵەبەرد لای مەریوان، بەرزایەکانی بەنیگەز، ئیسلاماوای ڕۆژاوا، کرماشان، سەرپێڵی زەهاو، کەنرووڵە، کێوی شاهۆ، کەل قەڵاجێ (٤٩و)

**گویژەسایلە** ☜ گویژەهەویرە

**گویژەسوورە:** بلچەسوورە

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

ڕواوگە: گوندی بلچەسوور و کێوی قەڵەبەردی لای مەریوان (٤٩و)

**گویژە کوردەکوژە**

راڤە: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە، ڕەنگی ڕەش و ئەندازەی گەورەیە

ڕواوگــە: کوردســـتان (١٣او)؛ وەکـــی گونـــدی مەڵەکشان و ڕەشنەش لای سنە (٤٩و)

**گویژکۆڵ**: گیژکوڵ

**ڕاڤە**: ناوی جۆرێکی دار گۆیژە

**ڕواوگە**: گوندی ڕەشنەشی سنە و گوندەکانی لای مەریوان (٤٩و)

**گوێبەرازە** ☜ گاگوێ

**گوێبەرخە**: میلەوەڕ، گیامەڕانە

**ڕاڤە**: ناوی ڕوەکێکە، ئەم گیایە ڕوەکی گۆشت بەرخیلە نیە بەڵکوو فرەتر بە گیای مێشەگیرەوە نزیکە کە لاسکەکانیشی چەسپناکن

**ڕواوگە**: کوردستان (١٣او)؛ وەکی بەشی باشوور (او؛ ٢٩و)؛ و گونـدی هـەرمێدۆڵـی سـەبەتلوو و کیلەشین لای سەقز (٤٩و)

**گوێچکەکەر** ☜ بنگەزیلە

**گوێچکەمشک**: سیپالینە

**ڕاڤە**: ناوی ڕوەکێکە گوڵـەکـانی هـەنێ چەشنی گوڵی گیای لیفەشرەن؛ ویدەچێ هـەمـان ڕوەکی لیفـەشـرە یـا ویـزەورە بێـت، هـەرچـەن ڕوەکـی گوڵەدەوری ناوی‌تری گوێ‌مشکەیە

**ڕواوگە**: کوێستانی ئاویەری گەورە لە سنە (٤٩و)

**گـوێز**: گـوێزی ئـازا، گـوێزە گـەڵـوازە، گـوێزە بێ‌تۆکڵ،گوێزە هێشـوو، گوێزە کوێرە، کوێرۆک، کوێرک، گوێزە گەلاوێژی، گوێزە سپیکە، گوێزە چـەرمـەڵـە، گـوێزە چـەورە، گـوێزە ڕۆنـە، گـوێزە درێژکە، گوێزە کۆماری

**گوێزبەلە** ☜ قێزبەلە

**گوێزە بێ‌تۆکڵ** ☜ گوێزە گەڵوازە

**گـوێزە چـەرمـەڵـە**: نـاوی جـۆرێکی دار گـوێزە، جۆرێ گوێز لە دەسـتەی ئـازا یـان گـەڵـوازە کـە کاکڵەیکی سپی هەیە

**ڕواوگە**: کوردستان (٧٨و)

**گوێزە چەورە**: گوێزە ڕۆنە

**ڕاڤە**: ناوی جۆرێکی دار گوێزە، جۆرێ گـوێز لـە دەستەی ئازا یـان گـەڵـوازە کـە کاکڵـەی چـەوری هەیە بە جۆرێ کە کاکڵەکەی تەڕ و چەور دیارە

**ڕواوگە**: کوردستان (٧٨و)

**گوێزە درێژکە** ☜ گوێزە کۆماری

**گوێزە ڕۆنە** ☜ گوێزە چەورە

**گوێزە سپیکە** ☜ گوێزە چەرمەڵە

**گوێزە کوێرۆک** ☜ گوێزە کوێرە

**گوێزە کوێرک** ☜ گوێزە کوێرە

**گـوێزە کـوێرە**: گـوێزە کـوێرۆک، گـوێزە کـوێرک، وەزەکۆر

**ڕاڤـە**: نـاوی جـۆرێکی دار گـوێزە، کاکڵـەی زەرد یان هەندێ بەرەو بۆری هەیە، توێکڵـە ڕەقـی زۆر ئەستوور و پتەوە کە بە تـەوژم کاکڵـەی داپۆشـیوە و دێر کاکڵە دەرتێت، بۆ بازاڕ و کاکڵە لەبـار نیـە، کەمکۆڵەکەشی دێر زەرد دەبێ و لێ‌دەبێتەوە

**ڕواوگە**: کوردستان (٧٨و)

**گوێزە کۆماری**: گوێزە درێژکە

**ڕاڤە**: ناوی جۆرێکی دار گوێزە، جۆرێ گـوێز لـە دەستەی ئازا یان گەڵوازە بەلام ئەندازەی هـەنـدێ درێژ و بەڕوویيە

**ڕواوگە**: کوردستان (٧٨و)

**گوێزە گەلاوێژی**

**ڕاڤە**: دەستەیکی گوێزی جیاواز نیە بەڵکوو لە نێو هەموو جۆرە گـوێزەکـانی نـاوبراودا دەبێـت، تـەنیـا ئەوەیکە ئەندازەی بچووکە و کاکڵـەی بـە کـەمـی لێ بەرهەم دێت

**ڕواوگە**: کوردستان (٧٨و)

**گوێزە گەڵوازە**: گوێزە بێ‌توێکڵ

**ڕاڤە**: ناوی جۆرێک گـوێزە، وەکـی گـوێزە ئازایـە بـەلام کـەمکۆڵـەکـەی زۆرتـر دەمتـرەک و جـوێ دەبێتەوە و هەندێکیش توێکڵی ڕەقی ئەستوورترە

**ڕواوگە**: کوردستان (٧٨و)

**گوێزی ئازا**
**راڤە:** ناوی جۆرێکی دار گوێزه، کاکڵە سپی یان زەرد، مەژگ چەور، کاکڵەی بەبازاڕ و پەسەند، کانی گەیشتن هەموو یان لای لە کەمکۆلەکەی زەردی بەرەو رەش و دەمترەک دەبێ، بە خێرایی کاردۆژه دەکرێ
**رواوگە:** کوردستان (٧٨و)

**گوێزیکێوی**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە لە دەستەی داری لێرەوارێ بەرێز خزری لە خەڵکی ئاوایەکانی نێ و ولەژێری لای مەریوانی بیستووە، گوایە لێرەوارێ لای زریوار و ئەم گوندانە گوێزی کێویان هەیە، من پێموایە هەمان داری شەقالە کە بە فارسی (گردو کوهی) دەبێت
**رواوگە:** گوندی نێ و ولەژێر لای مەریوان (٩٤و)

**گوێ مشکە** ☜ ١. گوڵە شاخۆچکە ٢. ناویتری رووەکێ گوڵەدەوری

**گوێورچە:** چەز
**راڤە:** ناوی رووەکێکە لە جۆری گیای گادەمە؛ زیدەری سەدرەدین بە گیای تاتوولەی داناوە
**رواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گۆپارۆک**
**راڤە:** ناوی رووەکێکی گەڵا وردە
**رواوگە:** چۆمان، خەلیفان و رەواندز (٢٠و)

**گۆترکە**
**راڤە:** ناوی رووەکێکی دڕکاویە، لاسکی ئەستوورە و سەر پڕ لە دڕکە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گۆزروان**
**راڤە:** ١. ناویتری گۆزربانە ٢. ناویتری گیای گەماڵدووە ٣. ناویتری گیای دوودووکەرە
**رواوگە:** رۆژهەڵاتی کوردستان (٩٤و)

**گۆزروانگورگی**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە لە جۆری گیای گۆزروان
**رواوگە:** گوندی حەسەناوای لای سنە (٩٤و)

**گۆزەرەبک**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە دەخورێت
**رواوگە:** کوردستان (٩٤و)

**گۆزەڵە گەون**
**راڤە:** ناوی جۆرێک رووەکی هەنگەونە
**رواوگە:** کێوی نەکەرۆز، پیرعومەران و قولقولەی میرەدێ سەقز (٩٤و)

**گۆسان**
**راڤە:** ناوی رووەکێکی کێویە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گۆنک**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە
**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**گۆیژەهەویرە:** گوێژەسایلە
**راڤە:** ناوی جۆرێکی دار گوێژه، رەنگی رەشە و گۆشتی تڵ و نەرمە
**رواوگە:** کوردستان (٧٨و)

**گووتک**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە بۆ خواردن دەشێ
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گوورز**
**راڤە:** ناوی رووەکێکی کێویە
**رواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گووژان**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە
**رواوگە:** دەڤەری هیران، خۆشناو و شەقڵاوا (٢٠و)

**گهاڕەنگ**
**راڤە:** ناوی رووەکێکە؛ رەنگە ئەم وشەیە هەڵەی پیتچنی تێدا بێت و راستەکەی گیارەنگ بێت
**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**گەبلە**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گەپلە:** شەقشەقۆک، گەڵۆکە

**راڤە:** ١. ناوی ڕووەکێکە پیازەکەی دەخورێ ٢. ناوی‌تری گیای هەمیشە بەهار ٣. ناوی ڕووەکێکە گوڵ ئاڵ و خڕە کە بۆ خواردنیش دەشێ؛ لای بۆکان و شاهین‌دژ ڕووەکێ بە ناو گیاگەپلە هەیە گەلاکانی باریکە و بۆ ناو دۆکولیو دەبێ ٤. ناوی ڕووەکێکە گەڵا باریکە و بۆ ناو دۆکولیو دەشێ

**ڕواوگە:** ١. ڕۆژهەلاتی کوردستان ٢. وەکی لای مەهاباد (٩٤و)؛ ٣. کوردستان (١٣و)؛ دەڤەری شاهیندژ (گوتەی کاک عوسمانی کەریمی خەڵکی ساروجە) (٧٨و)؛ ٤. دەڤەری کۆیە و پارێزگای کەرکوک (وەکوو دووبس، خویلێن، تووزخورماتوو، کفری، حەویجە) و پارێزگای ئادیەمەن، شارۆچکەی ئالدووش و گەرگەر، شارویران (٢٠و)

**گەرمڵە**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکی کێویە

**ڕواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گەرنگ**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گەرینەک**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە هووکارەی وایە هەڵدەچێت

**ڕواوگە:** کوردستان (٢٠و)

**گەرەگوێژ**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی دار گوێژە کوڵە

**ڕواوگە:** گوندی کەوبگاری لای کامیاران (٩٤و)

**گەزەر**

**راڤە:** ١. ناوی‌تری ڕووەکێ گێزەر ٢. ناوی ڕووەکێکە لاسکەکەی شیرینە و هەڵدەمژرێت

**ڕواوگە:** کوردستان (٩٤و)

**گەسک** ☜ جەریفک

**گەسکەکێوی**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە؛ وێدەچێ لە بنەماڵەی گسگە پووشینە بێت

**ڕواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩٤و)

**گەسکەوشان**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە

**ڕواوگە:** کوردستان (٣/١٤٧و)

**گەڤەس**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە شمەکی پێ دەڕەنگێنن

**ڕواوگە:** باشووری کوردستان (٦و)

**گەلاس**

**راڤە:** ١. ناوی‌تری داری هەڵووژە سوورە ٢. ناوی‌تری هەڵووژە زەرد ٣. ناوی‌تری داری گێلاس

**ڕواوگە:** کوردستان (١٣و)

**گەلابارام**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە، ئەوسا بۆ دەرمانی برین کەڵکیان لێ وەرئەگرت

**ڕواوگە:** گوندی مەولاناوای ناوچەی خورخورەی سەقز (٩٤و)

**گەلاڕێواسە:** گەلاڕیواسی

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە بۆ خواردن دەشێ و گەلاکانی چەشنی گەلای مێوە، ئەوسا بۆ دەرمانی کرمی ناوسک دەیاننواند؛ وێدەچێ هەمان گیا بێت کە لە سەردەشت هومێوی پێ ئێژن

**ڕواوگە:** گوندی بندۆڵ لای مەریوان (٩٤و)

**گەلاڕێواسی** ☜ گەلاڕیواسە

**گەلاز** ☜ گلاز

**گەلاکووان**

**راڤە:** ناوی ڕووەکێکە، چوونکوو گەلاکانی بۆ برینارەش بەکار دەچێت، پێی ئێژن گەلاکووان،

کووان بەواتای دومەلە

**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ځو)

**گەلاوارِنە**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە؛ وێدەچێ هەمان گیای وارِنە بێت

**رواوگە:** گوندی قەبلووجەی سەقز (٩ځو)

**گەلاوەرِەنە**

**راڤە:** ناوی رووەکێکە؛ رِەنگە هەمان گەلاوارِنە بێ

**رواوگە:** لای خورِخورِەی سەقز (٩ځو)

**گەلوالک**

**راڤە:** ناوی رووەکێکی کوێستانیە و پیازەکەی دەخورێت؛ وێدەچێ هەمان گیای کەلوالک بێت

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گەندەلۆ:** گەنەلۆ

**راڤە:** ١. ناوی رووەکێکە لە جۆری گیای هەڵز ٢. ناوی‌تری گیابۆگەنە ٣. ناوی رووەکێکی زەحراویە؛ لە گوندی نواوێ و شیوەجۆی سەردەشت بە گیابۆگەنە ئێژن

**رواوگە:** کوردستان (١٣و)؛ وەکی گوندی بست لای دیواندەرە و گوندەکانی لای بانە (٩ځو)

**گەنم:** حەوت گوڵە، زەرتکە، زەردکە، سەمەوەج، سوورگوڵ، سیارە، سیسا، گیلانە، لارە، مروشی، موریشی، مریشی، موریش، مەنجکی، میرج، مرج، وشتردانە، وشتر دیانە، هەویدی، گوڵە رووتە، گوڵرووت، دەیمی، رەشگوڵ، کوردی، رەزاوی، تارگان، رەقی، زۆردە، خووردە، سەحرایی، کوێستانی، قەندەهاری، قەنداری، سابریەگی، یەخەدادراوی، حۆلە، بەهاروو، هەژدان، ئەبدا، بزەنگ، تارگان، تاریگان، سپیوک، ستووخوار، سۆرکەڵە، شلێل، فەرەجە، گوڵ‌پەرِشە؛ سپیکە، پەریوەش، حەندولە، کاکول، مەلا

**گەنم‌گیا**

**راڤە:** ١. ☜ گەنمە، ٢. ناوی رووەکێکە؛ وێدەچێ هەمان گیای گەنمۆڵکە بێت کە دەنکی وەسە تۆی گەنم، یا گیای گەنم‌گیاو

**رواوگە:** ڕۆژهەلاتی کوردستان (٩ځو)

**گەنمە:** گیاگەنم، گەنم‌گیا

**راڤە:** ناوی رووەکێکە لە جوانیدا وەسە گەنم؛ ژێدەری سەدرەدین هەمان گەنمۆکەی داناوە

**رواوگە:** گوندی حسێناوای لای سنە (٩ځو)؛ و باشووری کوردستان (٦و)

**گەنمە ئەبدا**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**گەنمە بزەنگ**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

**رواوگە:** باکووری کوردستان (٢٠و)

**گەنمە بەهاروو**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

**رواوگە:** کوردستان (٩ځو)؛ وەکی بەشی باشوور (١و)

**گەنمە پەریوەش**

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

**رواوگە:** کوردستان (٩ځو)

**گەنمە تارگان**

گەنمە تاریگان

**راڤە:** ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

**رواوگە:** کوردستان (٩ځو)؛ وەکی بەشی باکوور و ناوچەکانی زاراوەی زازا (وەکی سندووس، دێرسیم، خەرپووت، سێوەرەک، ئادیەمەن، باکووری دیاربەکر، ئەرزنجان) (٢٠و)

**گەنمە تاریگان** ☜ **گەنمە تارگان**

**گەنمە حۆلە**

**راڤە:** ناوی جۆرێ گەنمە، دەنکەکەی گەورەس

ڕواوگە: کوردستان (١٣و؛ ٤٩و)

**گەنمە حەندولە**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)

**گەنمە حەوتگوڵە**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و؛ ١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)

**گەنمە خوردە**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

**گەنمە دەیمی**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

**گەنمە ڕەزاوی**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

**گەنمە ڕەشگوڵ**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە، لە گەنمە حۆلە وردترە، گوڵی ڕەش و دەنکی سپیە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و؛ ٢٠و)

**گەنمە ڕەقی**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

**گەنمە زۆردە**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

**گەنمە زەرتکە** ☜ گەنمە زەردکە

**گەنمە زەردکە:** گەنمە زەرتکە

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە، دەنک گەورە و زەرد ڕەنگە و دەنکەکانی فرە ڕەقن

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و؛ ١٣و)؛ وەکی بەشی باشوور (٦و)؛ و باکوور (٢٠و)

**گەنمە سپێوک**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: باکووری کوردستان (٢٠و)

**گەنمە سپیکە**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

**گەنمە ستووخوار**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: باکووری کوردستان (٢٠و)

**گەنمە سمەوەج:** گەنمە سمەوەج، گەنمە سمەوەژ

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە، هی ناوچەی کوێستانیە و بە دژواری لە کەلووی دێتە دەر

ڕواوگە: کوردستان (١٣و)؛ وەکی خانی (٣/٠٩/١٠و)

**گەنمە سمەوەچ** ☜ گەنمە سمەوەج

**گەنمە سمەوەژ** ☜ گەنمە سمەوەج

**گەنمە سۆرکەڵە:** گەنمە سوورکە

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە کە سوورە و وردە، بۆ نان باشە، یەکێکە لە جۆرەکانی گەنمی قەندەهاری

ڕواوگە: ناوچەی هەورامان (هەڵەبجە، باخەکۆن، بیارە، تەوێڵە، کێمنە، نەوسوو، نۆدشە، پاوە، سەولاوا، بێساران، باینگان و چەم ژاوەرۆ) (٢٠و)

**گەنمە سوورکە** ☜ گەنمە سۆرکە

**گەنمە سوورگوڵ**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە لە جۆری گەنمە ڕەشگوڵ کە بۆ پێشتی ساوەر دەبێ

گەنمە سۆرگوڵ: گەنمە سوورگوڵ

ڕواوگە: کوردستان (١٣و؛ ٤٩و)؛ وەکی بەشی باکوور (٢٠و)

**گەنمە سەحرایی**

ڕاقە: ناوی جۆرێکی گیای گەنمە

ڕواوگە: کوردستان (٤٩و)

